# ئەيلوول

# جەنگەڵی یەکەم

۱۹٦۰ تا ۱۹۷٥

## بەرگی یەکەم

نەبەز گۆران

## ناواخنی کتێبەکە.


دەرگای یەکەم..........................................

خێڵەکان تووڕەدەبن....................................

تیرۆرکردنی کەسایەتی کورد..........................

لێکترازان یەکترسڕینەوە...............................

شکست وهەڵسانەوە.....................................

تابلۆکەیەکڕەنگە.........................................

ناکۆکیەکان ی ناوخێڵ ی بارزان...........................

دینەمۆی دروستکردنی رەعیەت.............................

سەرنجام..................................................

پەراوێزوسەرچاوەکان......................................

# دەرگای یەکەم

قسەکردن لەسەر مێژوو قسەکردن نیە لەسەر خەیاڵێك یان ڕوداوێك یان زەمەنێك، بەڵکو قسەکردنە لەسەر ئەو عەقڵەی لەپشت هەموو گوتارەکانەوەیەو لەپشت هەموو ڕوداو یادەوەریەکانەوەیە، بۆئێمە مێژوو عەقڵە نەك ڕوداو، بۆ بڕێکی دی مێژوو ئاوەژوکردنی ڕوداوەکانە، گەر خراپترین مێژوو ئەو مێژووە بێت پڕە لەخوێن و شکست ئەوا خراپترین مێژوونوس ئەوکەسەیە ڕوداوەکان ئاوەژوو دەکاتەوە، ئەوەی تاکو ئێستە دەرکمان پێکردبێت کورد مێژوو نوسی نیە بەمانای مێژوو نووس گەریدە بەشوێن عەقڵی مێژوودا، بەڵکو تەنها کۆمەڵێك حکایەت خوێنی هەیە، و روداو نووسی هەیە بە بێ ئەوەی دەست بۆئەوە ببات لەپشت روداوەکانەوە چ عەقڵێك ئاراستەی کردون، ماهیەتی مێژووش عەقڵی پشت ڕوداوەکانە، هەرکاتێك مێژوو بویە حکایەت مانا راستەقینەکەی خۆی لەدەست دەدات، بۆئەوەی مێژووش وەك خۆی ببینین دەبێت ئەو عەقڵە بدۆزینەوە کەلەپشت روداو زەمەنەکانەوە وەستاوە تاکو مێژوو دروست بکات، جیاواز لەمەش هەموومان هەست بەو برینە دەکەین کە راستگۆیی کەمترین شانسی هەیە لە گێڕانەوەی ڕوداوەکان

لەمێژووی کورددا، ئینسانی کورد بەسیاسیەکانی و نووسەرەکانیەوە بەردەوام ترسێکیان هەبوە لەنووسینەوەی ڕوداوی ڕاستەقینە، هەمیشە دەمامکێك لەسەر ڕووی ڕستەکان دەرەکەوێت، ئەو دەمامکە پێمان دەڵێت ئەوەی کەتۆ دەیبینی ڕاستەقینە نیە، گەر زانیاری ڕاستەقینەت دەوێت لەناو ڕستەکاندا بۆی مەگەڕێ و لە شوێنی دیدا وێڵبە بەدوایەوە ئەو شوێنەش پشتی ڕستەکانە، ئەوان دەیانەوێت تەنها ئەو دیوەی مێژوو پیشانی نەوەکان بدەن کەجوانە، دیوە ناشیرینەکەی مێژوو کەبەشێکی گرنگی بنیاتنانی ئینسانی کوردە دەشادرێتەوە، ئەو دیوەتاریکەی کە لەناو مێژووی ئێمەدا پانتایەکی زۆری داگیرکردوە پێویستە بخوێنرێتەوەو لەسەری بوەستین، بە بێ ناسینی ئەو دیوە تاریکە قورسە قسەکردن لەسەر ئێستە، ئەوەی دیوە تاریکەکە دروست دەکات و ئەوەی دەیشی شارێتەوە و ئەوەی وادەکات ئەو دیوە تاریکە بکاتە بنیادێك بۆدروستکردنی جیهانێکی ناتەندروست ئەو عەقڵە سیاسیەیە کە لەم هەرێمەدا چەقی داکوتاوە. ئێمە هەوڵی جدی دەدەین بۆ ناسینی ئەو دیوە، ناسینی ئەو عەقڵەی لەسەر ئەو تاریکیە خۆی بنیات ناوەو بەردەوام ئامادەیی هەیە لە مێژووی ڕابردوو لە ئێستای ناکامڵدا. چەن گرنگە سەرکەوتنەکانمان

ببینین هێندەش گرنگە شکستەکانمان ببنین، رەنگە ئەم کتێبە گەشتێك بێت بەناو دیوە تاریکەکەی بەشێك لە جوڵانەوەی کورد نەك گەشتێك بێت لەبەشە روناکەکەیدا. ئەو بەشەی روناکە رۆژانە دەدرێت بەگوێماندا و دەست و پەنجەی لەگەڵ نەرم دەکەین، ئەوەشی تاریکەو گرنگە شاراوەتەوە وەك هەوڵێك لەم کتێبەدا دەریدەخەین.

چیرۆکەکانی ئەم دواییە کە لەژێر ناوی " یادەوەری و گێرانەوە" کەوتنە ناو کتێبخانەی کوردیەوە، هێندەی تر ئازاریان بە مێژووی رابردو و بە ئێمە گەیاند، ئەوانەی لەهەوڵی ئەوەدان مێژوو بکەنە یادەوەری ئەوانە جگە لەخەنجەرێك بۆسەر گیانی مێژوو شتێکی تر شك نابەن بەکاری بهێنن، بە یادەوەریکردنی مێژوو بە خنکاندنی ئێستە کۆتای دێت، ئەو لێشاوی یادەوەریەی کە مێژوویان کورت کردەوە بۆشەری گردێك یان حزبێك یان تاقمێك هەنگاوێك بوو کە مێژووی میلەتێکی تەسك دەکردەوە بۆ بەپاڵەوانکردنی هێزێکی بچوك و فەرامۆشکردنی ئیرادەی میلەتێك، هێزێك دەتوانێ مێژوویەك لەیادەوەری بۆخۆی دروست بکات، بەڵام ناتوانێ مێژووی میلەتێك بکات بە هی خۆی و مێژووەکەی خۆشی بکاتە مێژووی میلەتێك، چونکە

هەرکەسەو هەر هێزەو لەشوێنی خۆیدا مێژووی هەیەو جیاوازە لە مێژووە گشتیەکە کە هەمووان بەژدارن تێیدا، ئەوانەی کە دەبنە دینەمۆی مێژوویەکی راستەقینە ئەوانەنین یادەوەریەکانیان دەنوسنەوە، بەڵکو ئەو عەقلانەن لەپشت ئالوگۆڕە گەورەکانەوەن، هەمیشە ئەوانەی کەلەپشت ئالوگۆڕە گەورەکانی مێژوەوە دەوەستن کەمترینیان قسەلەسەر مێژوو دەکەن، لەبری ئەوە دەستکاری مێژوو دەکەن، ئەو تاقمەش کە گیرۆدەن بەیادەوەریەکانی خۆیان لەناو روداوەکانی مێژوو کۆمەڵێك دەنگی کپن کە لەناو مێژوودا دەبنە حکایەتی بچکۆلانە، جیهانی کورد پڕە لەو پاڵەوانانەی لەناو چیرۆکە بچوکەکاندا دەخنکێن، ئەم پاڵەوانانە هەرگیز پەیی بە عەقڵی مێژوونابەن، چونکە خۆیان لەیادەوەری دەبیننەوە، مێژووش کە کرایە یادەوەری ئیدی عەقڵەکەی خۆی لەدەست دەدات و دەبێتە روداوی بچوك، ئێمە لەم هەوڵەماندا بەشوێن روداوەکان ناکەوین، ناشمانەوێت چیرۆکەکان دووبارە بکەینەوە، بەڵکو روناکیەك دەخەینە سەر ئەو لایەنە تاریکەی کە هەرگیز سیاسی و یادەوەرنوسەکان نایانەوێت ئەو دیوە تاریکە بەرونی دەرکەوێت، لەگەڵ هەر روداویکدا عەودالی پشت پەردەکان دەبین، هەرچۆن نووسەرێکی کورد دەڵێت " بۆئەوەی ئەنفال بناسین دەبێت

بەعس بناسین" (١) واتە ئەوەی بکەری ئەنفالە بەعسە، بەبێ ناسینی بەعس قورسە قسەکردن لەسەر ئەنفال، ئەنفال ئەگەر یەکەم چرکەساتی سرینەوەی شوناسی کورد بێت، ئەوایەکەم چرکەساتی دەرکەوتەی هێزی بەعسە، بۆئێستای کوردیش گەر بمانەوێت پەیی بە ئێستا ببەین ئەشێ ئەیلوول بناسین، ئەیلوول یەکەم پایەی ناتەندروستی مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردە لەم هەرێمەدا، هەموو ئەو خانە ناکاملانەی کە ئێستە لەئاستی سیاسی و ئیداری و کۆمەڵایەتی کوردا بەدی دەکرێن ڕەگوریشەیان دەگەڕێتەوە بۆئەیلوول، بۆئەوەی ئێستە رون بێت لەبەر چاومان گرنگە قسە لە ئەیلوول بکەین. گەرچی کەمترین رەخنە لەسەر ئەیلول دەرەکەوێت، بەلام بنەمای هەموو کێشەکان لەو خاڵەوە دەست پێناکەن کە ئەیلول ناخوێنینەوە بەڵکو لەو خاڵەوە دەست پێدەکەن لەبری دیدێکی رەخنەی بۆئەو سەردەمە دیدێکی ستایش هاتوەتە شوێنی، ئەم دیدە ستایشە ماڵوێرانی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت و ئەسڵی شتەکان لێڵ دەکات.

ڕەنگە دەست بردن بۆئەیلوول کە لای حزبێك شۆرشە، و لای حزبێکی دی پەرچە کردارە کارێکی ئاسان نەبێت، وەڵێ بۆئێمە چرکەساتێکە لە مێژووی کورد کە ئەشێ خوێندنەوەی زۆر جدی

بۆبکرێت، دەشتوانین بە پشت بەستن بە کۆمەڵێك سەرچاوەی گرنگ بۆ نەوەکانمانی ڕون بکەینەوە ئەیلوول شۆرش نەبوە، بەڵکو پەرچە کردارێکی خێڵەکی بوەو ناوی لێنراوە شۆرش، نابێت لەوە بترسین دەست بخەینە سەر برینەکان، هەرچۆن ناشبێت لەوە بترسین مێژوو جیابکەینەوە لە روداو ئاواش شۆرش جیادەکەینەوە لە پەرچە کرداری خێڵەکی، ئەوەی ئەیلول دروست دەکات عەقڵێکی سیاسی و گرنك نیە، هوشیاریەکی نەتەوەیش نیە، شەپۆلی هوشیاری نەتەوەی پێش ئەیلول لەگەڵ سەرهەڵدانی مۆدرێنەتەدا رولەم ولاتەدەکات و ئەیلول زۆر بێخەبەر بوە لەو شەپۆلە، بۆیە خولقێنەری ئەو شەپۆلە مۆدێرنەتەیە نەك ئەیلول و بەرپرسیاری هوشیاری گشتیش نیە، بەڵکو کردارێکی دەسەلاتی عێراقەو پەرچەکرداری خێڵەکاںن بەشوێنیدا دێت، بەلام بۆ ئێمە پێویستە بپرسین ئەوەی لەو سالانەی ئەیلول رویدا چی بوون؟ ئایا شۆرش بوو یان وێرانکردنی ئیرادەی شۆرش؟ شۆرش چیەو ئیرادەی گشتی چیە؟ ئەی پەرچەکردار و جەنگاوەری چیە؟ شۆرش بیرکردنەوە دروست دەکات یان جەنگاوەر؟ جەنگاوەر کێیەو شۆرشگێر کێیە؟ ستەم چۆن دروست دەبێت و لەناو ستەمدا چۆن وێڵبین بۆ سرینەوەی ستەم؟ ئەی ئەگەر ئەیلوول نەبوایە چی دەبوو؟ ئەگەر

خستە بەردەم رابڕوو کارێکی هەڵەییە یان وەستانە لەسەر رابردوو؟ بۆچی شکستی حزبێك بویە شکستی میلەتێك؟ ئایا ئەیلول کارەکتەری کوردی تێکشکاند یاخود بنیادی نایەوە؟ لەبری هێزی چەکداری کورد خەباتی مەدەنی بکردایە چی رویدەدا؟ هەر ئەوەندە بەسە شانازی بە سەرکەوتنەکانی شەرەوە بکرێت و بڵێین مێژوومان هەیە؟ ئایا بۆچی مێژووی میلەتێك بچوك دەکرێتەوە بۆ بازنەی چەندشەرێکی جەنگاوەران؟ ئەوەی ئەیلوول بەخشیە ئینسانی کورد چی بوو؟ بۆگەران بەشوێن ئەم هەموو پرسیارەدا گرنگە دەست بۆکام چرکەساتی مێژوو ببەین؟ ئەیلوول جەنگەڵێك بوو بۆ کپکردنی کارەکتەری کوردی یان فەزایەك بوو بۆ دەنگ بەرزکردنەوەی کارەکتەری کوردی؟ جیاوازیەکان لەکوێدابوون لەو بەرگری کردنەی بەشێکی کورددا؟ کێ جیاوازیەکانی دورست کردن و کێ هەوڵی کوشتنی جیاوازیەکانی دەدا؟ دەنگی ئازاد لە ئەیلولدا لە چ خانەیەکدا بوو؟ بەرلەوەی بەعس دروست بێت زیندان و ئەشکەنجەدانی کارەکتەری کوردی چ مانایەکی هەبوو؟ کوشتن چ مانایەکی هەبوو؟ شۆرش بەبێ کوشتن و لەناو بردنی یەکدی دروست دەبێت؟ ئەگەر دروست دەبێت چی وادەکات لە شۆرش هەوڵی سرینەوەی ئەوانە بدات کە خەباتیان بۆدەکات؟. شۆرشی

راستەقینە بۆهەمووانە یان بۆ تاقمێك؟ دروستکردنی زیندان و جەهەنەمێکی بچوك بۆ رەنگە جیاوازەکانی ناو سەرهەڵدان ئیشی شۆرشە یان ئیشی یاخی بون؟

پرسیاری زۆر لەسەر ئەیلوول وەك سەردەمێکی بەرگری کردن دێنە ناو خەیاڵدانی هەریەك لەم نەوەیە، هەرپرسیارێکیش کۆمەڵێك ماناو دیدی تایبەت لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت، نابێت قایل بین بەیەك وەڵام و یەك سەرچاوە، بۆئەوەی بزانین بەرهەمی ئەو سەردەمە چی بوو ئەشێ بگەرێین بەناو ئەو جیهانەدا تا خاڵە لاوازو رونەکان دەدۆزینەوە، هەرکاتێك توانیمان ئەو سەردەمە بناسین ئەوا توانیومانە قسە لەسەر ئێستاش بکەین، ئەم جیهانە خراپەی ئێستە ئێمەی تێکەوتوین بەرهەمی سەردەمی ئەیلوولە. لەم دەروازە بچوکەدا بەخوێنەران دەڵێم ئەم کتێبە گەرانە بەشوێن وەڵامی ئەو سەردەمەداو خوێندنەوەیەکی سادەی ئەو جیهانەیە کە من بە جەنگەڵی ئەیلوول تەفسیری دەکەم، رەنگە لێم بپرسن بۆچی جەنگەڵی ئەیلوول، ئەوکات بۆوەڵامی ئەو پرسیارەی ئێوە دەڵێم، بفەرموون ئەم کتێبە بخوێننەوە و ئێوەش حوکم لەسەر ناوی کتێبەکە بدەن. ڕوداوەکانی ساڵی ١٩٦٠ تاکو ١٩٧٥ زۆر ترین ئەو ڕوداوانەن

بەنا عەقلانی دروست بوون و سەریان هەڵداوە، چۆن میلەتێك خاوەن خەونی گەورە بوە لەخۆی رازی بوە سەرکردایەتیەکەی هەمیشە هەڵەبکەن و لێی قبوڵبکەن؟ چۆن دەبێت گروپێك بێت لەپێناو دەست کەوتی بچوك هەڵەی گەورە بکات! یان مێژوو نوسەکان چۆن حەق بەخۆیان دەدەن باز بدەن بەسەر ئەم هەموو کارەساتەدا کە ئەیلول دروستی کردوە؟ و لەبری دەرخستنی دیوە خراپەکە سەردەمێکی پڕلەکارەساتیان کردوەتە سەروەری؟ ئێمە هەرگیز لەخۆمان خۆشنابین چاو لەو هەلانە بپۆشین، ئەم هەوڵەش تەنها دەرگایەکە بۆ تەماشاکردنی بەشێکی کەمی ئەو هەلانە کە لەو سەردەمەدا روویانداوە، نەك خوێندنەوەی کۆی گشتی ئەو سالانە. ئەگەر لێرەو لەوێ شتێکمان بیر چوبێت یان بەسەریدا گوزرەمان کردبێت پەیوەندی بەنەبوونی سەرچاوەوە هەبوە نەك پەیوەندی بە بێخەمی ئێمەوە بوبێت. سەرچاوەکان هێندە کەمن لەسەر راستی روداوەکان کەسی خوێنەر تێرناکەن، لەبەرامبەر ئەمەشدا سەرچاوەی ستایشکەر هێندە زۆرن هەرکەسێك بیەوێت کتێبێکی ستایشی بنوسێت بەچەندین بەرگ رزگاری نابێت، هەرئەمەیە وادەکات میلەتێك هەمیشە بێ ئاگابێت لەرابردوی خۆی چونکە ستایشکەرەکان ئەو کارەیان کردوە بۆدەسەلات باشبێت و بۆ ئەو هێزە باشبێت کە پێی

**خۆشە لەبری دەرخستنی دیوە شاراوەکەی دیوەکەی دی پیشان بدرێت، ئەو دیوەی بەدڵی ئەوانەو گەوەری ئەوان پیشان دەدات و لاوازیان ناخاتە بەردەم چاوەکان، ئێمە ئەم کارەناکەین گەرچی بکەوینە ناو لێشاوی تورەبوونی ئەو لەشکرەوە بەڵام پیشاندانی روداوێکی راستەقینە گرنگترە تا رازی کردنی دڵی حزب و دەسەڵات. باخوێنەرەکانیش بمان بوورن لە هەر کەموکورتیەك. دەزانین هیچ هەوڵێك بێ کەموکوڕی نیە، ئەوەش دەزانین ئاقیبەتی ئەم ئیشانە چەن ئازار و سەختی دەهێنێتە بەردەمان، سەختیەکانمان پێخۆشترە لە ستایش کردن و شاردنەوەی راستیەك.**

# خێڵەکان تووڕە دەبن

لەسەرەتای پەنجاکان لە ١٤ تەموزی ١٩٥٨ عەبدولکەریم قاسم بەکۆدیتایەکی سەربازی هاتەسەر دەسەڵات و سیستەمی پاشایەتی عێراقی گۆڕی بە سیستەمی کۆماری(٢) هەر لەگەڵ هاتنی دەسەڵاتی عەبدولکەریم بۆ عێراق بڕیاریدا هەموو ئەوانەی نارازین لە سیستەمی حکومڕانی عێراق ببەخشرێن و بێنەوە نیشتیمانی خۆیان، هەر لەو سەرو بەندەدا بڕیاری دا ئەو کۆمەڵە چەکدارەی لەدوای شکستی کۆماری مهابات رویان لە روسیاکردبوو بەمەبەستی خۆ لادان و دەستگیر کردن، بگەڕێینەوە خاکی عێراق، لەگەڵ گەڕانەوەی بارزانی و هاوڕێکانی بۆعێراق بە پاڵپشتی حکومەت پێشوازیەکی گەورەیان لێکرا(٣) لەبەغداد بارزانی و قاسم چاویان بەیەك دەکەوێت، لەو دیدارەدا بارزانی و قاسم باس لەوەدەکەن کە شوێنێکی تایبەت بۆبارزانی تەرخان بکات و سوپاس گوزاری خۆی بگەیەنێت بەقاسم کە بڕیاری گەڕانەوەی داون بۆ عێراق، لەشاری بەغداد و لەیەکێك لەگەڕەکە شانشینەکانی ئەو کاتی بەغداد قاسم کۆشکێك بۆ بارزانی تەرخان دەکات و ئەو ماوەیە بارزانی و کۆمەڵێك لەدەست و پێوەندی لەو ماڵە لەدەوری

کۆدەبنەوە، لەو کاتەشدا چاوی بەدەیان کەس دەکەوێت، هەر لەلایەن قاسمەوە بودجەیەکیان بۆتەرخان دەکرێت تا گوزەرانی پێبکەن، بەشەکەی تری هێزەکەش دەگەڕێنەوە سەرژیانی خۆیان و هەندێك لەوانەش دەچنەوە سەر وەزیفەی کۆنی خۆیان کە پێشوتر لێیان قەدەغەکرابوو، هەموو ئەوانەش بریاری یاسایان هەبوو، بە کێشەیەك تۆمەتبارکرابوون لەلایەن فەرمانێکی سەرۆکایەتی عێراقەوە بەخشران و هیچ کێشەیەکی یاساییان نەماو وەك هاولاتی عێراق تەماشا دەکران، لەو دیدارانەشدا کە لەنێوان قاسم و بارزانی رویاندەدا باس لەمەسەلەی کورد نەکراوەو رێزی دەسەلاتەکەی قاسم بۆ گەراوەکان تەوەری دانیشتنەکە بووە، هیچ سەرچاوەیەك نیە پێمان بلێت پرۆژەی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەو دانیشتنانە خرابێتە بەدەم قاسم، بۆیە پاش ئەوە بارزانی و یاوەرەکانی لە کۆبونەوەکە هیچ لێدوانێکیان نەداوە لەبارەی کوردستانەوەو بەڵکو وەك هاونیشتیمانیەك لەعێراق مانەوەو پەیوەندیەکانیان لەگەڵ حکومەت بەهێز بوو. ئیدی فەزای ناکۆکی نێوان کورد و عێراق بەرەو هێمنی دەچێت و ماوەیەکی زۆر هەردوولا بەبێ دروستکردنی ململانێ لەناو عێراقدا پێکەوە دەژین، بەس ئەم پێکەوە ژیانە نابێتە کۆڵەکەیەك بۆ ئەوەی پرۆژەی پێکەوە ژیان

و پێکەوە کاری سیاسی ئەنجام بدرێت، بەڵکو هەریەك لەو دوو هێزە کار بۆ ئەوەدەکەن خەیاڵە شاراوەکانی خۆیان ئەنجام بدەن.

ئەم بریارەی قاسم نەبوە دەرگایەك بۆگفتوگۆکردن لەبارەی کێشەکانی کوردەوە، بەڵام قاسم یەکەم سەرۆکی عێراقە باسی لەوەکرد عێراق دوو نەتەوەیە کورد و عەرەب، خودی خۆشی تاك لایەنە بەبێ کاریگەری کوردە گەڕاوەکان نەتەوەی کوردی خستە ناو دەستووری عێراقیەوە، ئەم کاریگەریەی قاسم پەیوەندی بە لایەنە سیاسی و سەربازیەکانی کوردەوە نەبوە پەیوەندی بەوە هەبوە دایکی کوردی " فەیلی" بوەو ئەم هەستەی وایی لێکردوە لە حکومەتەکەیدا گرنگیەکی تایبەت بە کورد بدات، بۆیە بویە یەکەم سەرۆکی عێراق بەشێك لەمافەکانی کورد بدات و دان بە بوونی نەتەوەیەکی دی بنێت لەعێراقدا. لەوسەردەمەشدا پارتی وەك حزب کاری دەکردو چەندین جار گفتوگۆی سیاسی لەنێوان حزب و دەسەڵاتدا رویداوە، بەڵام گفتوگۆکان هەرگیز لەئاستی باڵادانەبوە لەئاستی خوارەوە یەکتر ناسیندابوە نەك وەك نوێنەری کورد رویدابێت، بەڵام هیچ سەرچاوەیەك باس لەوەناکات کاتێك بارزانی و قاسم کۆبونەتەوە کۆبونەوەکانیان لەسەر کێشەی کورد بوبێت یان لەسەرپرۆژەی

پێکەوە کارکردنی سیاسی، ئەدەبیاتی رۆژنامەوانی ئەوکاتەی حزب هەرگیز دیدارەکانی لەسەر کێشەکانی کورد نەگواستوەتەوە بەڵکو دیدارەکانی وەك دوودیداری دووسەرکردەی دۆست پیشانی خوێنەران داوە، هەندێك لە سەرچاوەکانیش قسە لەسەر ئەوەدەکەن کە لەسەر کێشەی نیشتە جێ بوونی خۆی و هەوادارەکانی و رێگەدان بوە بە حزب کاری سیاسی و رۆژنامەوانی لە شارەکانی عێراقدا قاسمیش هەموو ئەوداوایانەی قبوڵکردوە. دەسەڵاتەکەی قاسم هیچ رێگریەکی نەکردوە لە بلاّوکردنەوەی رۆژنامە بەزمانی کوردی و هیچ رێگریەکی نەکردوە لە کاری سیاسی حزب لەشارەکانی عێراق(٤) .

ئەم پەیوەندیەی بارزانی و قاسم درێژە دەکێشێت تائەو کاتەی حزبی شویعی عێراق بەهێز دەبێت و بارزانی دەورێکی سەرەکی دەبینێت لەگۆڕینی بیروڕای قاسم دژ بە شویعیەکان(٥) یادەوەری شویعیەکان پێمان دەڵێ بارزانی دینەمۆی سەرەکی تورەبونەکانی قاسم بوە لەو حزبە، لەبری ئەم کارە بارزانی بەرەیەکی سیاسی پێکبهێنایە بۆ دروستکردنی پرۆژەی نەتەوەی کورد و بیخستایەتە بەردەم قاسم دەیتوانی فشاری

زیاتر دروست بکات و هەنگاوی گەورە تر بهاوێت، بەڵام لەبری ئەم دیدە سیاسیە زەمینە سازیکرد بۆ دروستکردنی ناکۆکی نێوان حزبی شویعی و قاسم، کاتێك قاسم بریار دەدات بەرەنگاری شویعیەکان بێتەوە زەمینەیەك بۆبارزانی ساز دەبێت بتوانێت ئاستی حزبەکەی بەتایبەت لەناوچە کوردیەکان بەهێزتربکات، بەپێی قسەی شویعیەکانی ئەوکاتە بارزانی بۆیە هەوڵی داوە قاسم دژ بە شویعیەکان بەکار بهێنێت بۆئەوەی خۆی و حزبەکەی بتوانن زیاتر دەستیان کراوەبێت، چونکە پێش پارتی لەکوردستان حزبی شویعی تاقە حزب بوە زۆرترین هەوادارو ئەندامی هەبوە، کەوتنی حزبی شویعیش لەسەر ئەوەبوە ئایا دژی بریارەکەی قاسم بن یان پشتگیری بکەن، لەدوا کۆبونەوەیاندا بەیەك دەنگ بریار لەسەر ئەوەدەدەن کە پشتی بیروباوەرەکانی روسیا بکەن و دژ بە دەسەلاتەکەی قاسم کار بکەن(٦) . روسەکان قاسمیان بە مەترسی زانیوە بۆسەر بەرژەوەندیەکانی خۆیان، پێیان وابوە قاسم بالأنسی روسیا لە عێراقدا کاڵ دەکاتەوە بۆیە هەمیشە وەك نەیارێکی خۆیان تەماشایان کردوە، ئینگلیزەکانیش بە دژی دەسەلاتی پارچە پارچەی ئاغاکانیان دەبینی و دژایەتی قاسم بۆ ئاغاکان پشتگیری ئینگلیزەکانی لەدەست دابوو، ئیدی حزبی شویعیش

لەبری پرۆژەیەکی تایبەتیان هەبێت و لەرێگەی ئەو پرۆژە تایبەتەی خۆیانەوە مامەڵە لەگەڵ قاسم بکەن هەمان سیاسەتی روسیایان دووبارە دەکردوە وئەو کارەیان دەکرد کە روسیا دەوێت نەك ئەو کارەی خەڵکی عێراق و فەزای عێراق دەیەوێت، مامەڵەیان لەگەڵ بۆچونەکانی روسەکان کردوە نەك مامەڵەیان لەگەڵ دۆخەکەکردبێت، خوێندنەوەی جیاوازیان نەبوە بۆ تاکی عێراقی و هەمیشە لەگەڵ شەپۆلە سۆڤیەتیەکە مەلەیانکردوە، بارزانیش ئەمانەی بەهەلدەزانی و وردە وردە خۆی دورخستەوە لەقاسم، بۆیە پەیوەندیەکانی بارزانی و قاسم تا سالآنی سەرتایی شەستەکان درێژەی کێشا، لەم چەند ساڵەدا نە پارتی وەك حزب نە بارزانی وەك کارەکتەرێك نەیانتوانی گفتوگۆکانیان لەئاستی شەخسیەوە بکەنە ئاستی سیاسی و قسە لەسەر کێشەی کورد بکەن لەعێراقدا، بەڵکو تەنها بیریان لەوەدەکردەوە لەعێراقدا زەمینەیەك سازبێت بۆکاری حزبی و کۆمەلآیەتی ئەوان، قاسمیش نکۆڵی لەم کارە نەکردوە، هیچکام لەسەرچاوەکان لەو سەردەمەدا باس لەوەناکەن کە بارزانی و پارتی جارێك بۆجارێك وەفدێکی رەسمیان بەپرۆژەوە ناردبێتە لای دەسەلآتی عێراق بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کێشەکانی کورد، گەر کارێکی لەو جۆرەش بوبێت لەئاستی تاکە کەسیدا بووە،

پاشەوەی ئیدی قاسم لە سەرەتای شەستەکان بڕیار دەدات پرۆژەیاسایەك جێبەجێبکات بۆ چاکسازی زەوی و زار. ئەو پرۆژە یاساییە زەوی کشتوکاڵی لەدەستی ئاغاو سەرۆك خێڵەکان دەسەنێتەوەو دەیداتە جوتیارەکان، ئەم پرۆژە یاساییە دەبێتە دەروازیەك بۆ شویعیەکان و بارزانی کە دژی قاسم بن، چونکە بارزانی ئیدی پێی باش بوە دوور بکەوێتەوە لەقاسم و هەوڵبدات خۆی جارێکی تر کاری سیاسی بکات، ئەم پرۆژە یاساییەی دەسەلاَتەکەی قاسم هیچ پەیوەندی بەکێشەی کوردەوە نەبوە، بیانوش بوە بۆ دژ بوون بەدەسەلاَتی قاسم، سەرۆك خێڵەکانیش ئەم پرۆژەیەیان قبوڵ نەبوە، شویعیەکانیش لەبری ئەوەی پشتگیری قاسم بکەن تاکو زەوی بۆجوتیارەکان بگەرێتەوە ئەوانیش بەهەمان میتۆدی بارزانی دژی قاسم دەوەستنەوە، وەستانەوەی شویعیەکان دژی قاسم پەیوەندی بە رابردوی ئەو حزبەوە هەیە لەگەڵ دەسەلاَتەکەی قاسم(٧). کاتێك خێڵەکان تورەبوون ئیدی خۆیان کۆکردەوە دژ بە دەسەلاَتەکەی قاسم، جوتیارەکانیش لەبری ئەوەی پشتگیری ئەو پرۆژە یاساییە بکەن کەوتنە ژێرکاریگەری سەرۆك خێڵەکان و خۆیان کۆکردەوە بۆشەرێك کە دژ بە بەرژەوەندی خۆیان بێت.

هەرلەو سەرو بەندەدا کە بارزانی هاتوچۆی قاسمی کردوە لە ژێرەوە پەیوەندی بە روسەکانەوە هەبوە تاکو یارمەتی بدەن، حزبەکەشی پەیوەندی بە ئێرانەوە بوە بۆ هاوکاری کردنی، عیسا پژمان دەڵێت" ئێمە هەستمان بەمەترسی دەکرد بەرامبەر قاسم بۆیە پەیوەندیمان بە پارتیەوە کرد وەك ساواك و بارزانیمان بینی و بەڵێنمان پێدان گەر دژی قاسم بچنە شاخ هاوکاریان دەکەین"(٨) دیارە لەوکاتانەی بارزانی دۆستی قاسم بوە لەپشتەوە کاری کردوە بۆ کەوتنی دەسەلاتەکەی قاسم، بۆیە خۆی پەیوەندی بە قنسوڵی روسەکانەوە کردوە داوای هاوکاری لێکردون، هاوکارەیکەی روسیا کە برە پارەیەکی مانگانە بوە بۆبارزانی و چەکدارەکانی، لەرێگەی ئەو کەسانەوە دەگەیەنرایە دەستی بارزانی کە ژنەکانیان روسی بوە، بەبیانوی وەرگرتنی هاوکاری ئەو ژنە روسیانە چونەتە قونسوڵی روسیا لەبەغداد و پارەکەیان بۆ بارزانی هێناوە، ساواکیش پاش ماوەیەکی زۆر بەم کارە دەزانێت، حزبەکەشی لەگەڵ ئێران رێکەوتوەو لەناو خاکی کوردستانیش خێڵەکانیان هانداوە دژ بە قاسم راپەرن. چوار زەمینە سازی هەبوە بۆئەوەی بارزانی دەست بداتەوە چەك، یەکەم روسەکان یارمەتیان داوە، دووهەم ئێرانیەکان یارەمەتیان داوە، سێهەم پرۆژە یاساکەی زەوی و زار یارەمەتی داوە،

چوارەم سەرۆك خێڵەکان یارمەتیان داوە. ئەوەی جێگەی تێرامانە حزب وەك مەکتەبی سیاسی نەیان توانیوە ئەو بۆشایانە پربکەنەوەو بەردەوام ئەرکەکانیان بۆ بارزانی جێبەجێکردوە. برێك باوەریان وایە ئەو سەردەمە پێویستی بە کارەکتەری سیاسی بەهێز نەبوە بۆسەرکردایەتی کردنی ئەو تورەبونە، بەڵکو پێویستی بە سەرۆك خێڵێك کە پێشوتر رابردوی هەبوبێت لەشەردا بۆسەرکردایەتی کردن بۆیە ئەرکەکانی مەکتەبی سیاسی لە پێناو بارزانی بووە، ویستویانە پاڵەوانێك دروست بکەن بۆبەرەنگار بونەوە، کورد ئەو سەردەمە پێویستی بەدروست کردنی پاڵەوان هەبوە. ساڵانی نیوەی چلەکان کە حزب بارزانی کردە سەرۆکی خۆی، لەمەهابات گەرابویەوەو چەن جموجوڵێکی ئەنجام دابوو لەناوچەکانی کوردستان، ئەم جموجولانە بوبونە هۆی ئەوەی خەڵکێکی زۆر لەدەوری کۆببنەوە و لەناو حزبدا هیچ رکابەرێکی نەبێ و حزب کەوتبویە ژێر ئەو کاریگەریانەو خۆی دابویە دەست دەسەلاتەکانی بارزانی.بۆحزب گرنگ بووە کەسێکی وای دەستکەوێت و بۆ بارزانیش گرنگ بوە ئەو دەسەلاتەوەربگرێت و زۆرترین کەس لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە.

ئەم زەمینە سازیانە وایکردوە دژ بە قاسم شەرەکان دەست پێبکەنەوە، عیسا پژمان دەڵێت" من شۆرشی کوردم هەڵگیرساند بە بریاری شا، ئەوکاتە نزیکەی ٣٠٠٠ چەك و پارەیەکی زۆرم هێناو دامە بارزانی و وتم شۆرشەکەتان دەست پێبکەن دژی قاسم و دەستیان پێکرد"(٩) دژی ئەم قسەیەی پژمان مەسعود بارزانی لەکتێبەکەی خۆیدا دەڵێت" ئەو پارەیە بەئێمە نەرداوەو باوکم پەیوەندی بەروسەکانەوە هەبوە نەك ئێرانیەکان"(١٠) سەرچاوەی شایەتحاڵەکانیش دەڵێن پژمان راست ناکات و دیکۆمێنتەکانی ساواکیش قسەکەی پژمان پشتراست دەکەنەوە، کەواتە بەپێی ئەم دوو سەرچاوەیە بارزانی لەیەك کاتدا پارەو چەکی لەدوو وڵات وەرگرتوە تاکو دژ بە قاسم بێت، لەلایەکی تریشەوە قاسمی هانداوە دژی شویعیەکان و لەژێریشەوە لەگەڵ شویعیەکان رێکەوتوە بۆ دژایەتی کردنی قاسم، دەرکردنی پرۆژە یاساکەی زەوی و زار ئیدی خێڵەکان تورە دەکات و شەرێك لەنێوان قاسم و خێڵەکان دەست پێدەکات. ئەو سیناریۆیانەی بارزانی نەخشەی بۆکێشاون بەشێوەیەکی روون دەستیان پێکردوەو ئەویش هەنگاوەکانی خۆی ناوە.

سەرهەڵدانی ئەیلول سەرهەڵدانێك نەبوە لەسەر بنەمای تێگەیشتن و ستەمی بەرامبەرەکە دەستی پێکردبێت، بەڵکو سەرهەڵدانێك بوە لەسەر داوای دەوڵەتانی دراوسێ و تورەبوونی خێڵەکان هەڵگیرساوە، یەکەم سەرهەڵدانی ئەیلول حزب وەك دینەمۆی سەرەکی هەڵی نەگیرساند، بریارێکی یاسایی بوەتە هۆی تورەبوونی خێڵەکان و پاڵپشتی ئێران و روسیا وای کردوە بارزانیش بچێتە تەنیشت خێڵەکان و سەرهەڵدانەکە دەست پێبکات، کاتێك سوپای عێراقی ئەوکاتە هەڵەکوتێتە سەر کوردستان دژ بە و سەرهەڵدانە دێتە کوردستان کە دژی بریارێکی یاسایین نەك دژ بە کوردەکان و لەسەر مەسەلەی کورد بوون. قاسم خۆی یەکەم کەس بوو نەتەوەی کوردی خستە ناو پرۆژە یاساکان و هەرخۆشی یەکەم کەس بوو داوای گەرانەوەی کوردە ئاوارەکانی کردو بریاری دا لە سیستەمی حکومرانی عێراقدا بەژداریان پێبکات، هەرقاسمیش بوو رێگەی دا حزبە سیاسیەکانی کوردستان چالاکی سیاسی خۆیان لە عێراق جێبەجێبکەن، سەرکردە کوردەکانی ئەو کاتە لەبری ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە لەرێگەی حکومرانی و خەباتی پێکەوە ژیانەوە هەروەك چۆن ئێستە بەشێکن لە سیستەمی حکومرانی عێراق کاربکەن، هەڵسان بەشێوەیەکی نهێنی پەیوەندیان لەگەڵ

ئێرانیەکان و روسەکان بەست بۆئەوەی دژ بە دەسەلأتەکەی قاسم بجەنگن. پێش رێکەوتنەکەی بارزانی لەگەڵ روسەکان و ئێرانیەکان دژی قاسم هیچ زەمینە سازیەك نەبوە بۆسەرهەڵدان و دەست پێکردنەوەی بەرەنگاری، بیانویەك نەبوە کە قاسم دژی کورد بێت و کوردەکان شەری بکەن، بەلأم ئەو رێکەوتنانەی لەپشت قاسمەوە بارزانی ئەنجامی دا فەزای کردوتەوە بۆ شەر هەڵگیرساندان، ئەگینا سەردەمی قاسم سەردەمی کپکردن و کاڵکردنەوەی کورد نەبوە، گەر بارزانی و حزبەکەی ئەم کارەیان نەکردایە شەرێکیش روینەدەدا لەو نێوانەدا، ئەو شەرەی قاسم کردی لەگەڵ کورد پەرچەکردار بوو نەك پرۆژەیەکی تایبەتی حکومەتەکەی قاسم بوبێت، گەرقاسم بیزانیبا بارزانی ئەوکارانە دژی ئەودەکات و دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی شەرێکی دی داوای نەدەکرد خۆی و چەکدارەکانی بگەرێنەوەو لێیان خۆش نەدەبوو، بەلأم قاسم چاوەرێی ئەوەی نەکردوە بۆیە ئەوکارەی ئەنجام داوە، وەختی شەرەکانیشی هەمیشە باسی لەکۆتای هاتنی یاخی بوون دەکرد نەك باسی لەکۆتای هاتنی داوا رەواکانی کورد و نەتەوەکە کردبێت. بەگەرانەوەیەکی سەرەتایی بۆ گوتارەکانی ئەوکاتی قاسم تێدەگەین قاسم ئەو کارەی بارزانی بەخیانەت لەخۆی تەماشا کردوە نەك شەرێکی هەبوبێت لەگەڵ

کوردو نەتەوەی کورد، بۆیە تاکۆتایی هاتنی دەسەڵاتیشی ڕێگەی نەداوە کورد وەك نەتەوە لەدەستوری عێراقی بێتەدەرەوە.

ئێرانیەکانیش قاسمیان بەکێشەو ڕێگریەکی زۆر دادەنا لەبەردەم خۆیاندا، بۆیە هەوڵی ئەوەیان دەدا دەرگایەك بکەنەوە بۆ دروستکردنی ناکۆکیەك لە عێراق و کۆتایی بەدەسەڵاتەکەی قاسم بهێنرێت، تاقە دەرگاش کورد بوو، نوێنەری ئێرانیەکان و دەزگای نهێنی ساواك " عیسا پژمان" هاتوەتە عێراق و پەیوەندی بە سەرکردە کوردەکانەوە کردوەو بەڵێنی ئەوەی لێوەرگرتوون دژ بەقاسم شەر بکەن، بریاری چاکسازی زەویی و زار و هاوکاری ئێرانیەکان و هاوکاری روسەکان لەرێگەی قونسڵگەری خۆیانەوە لەبەغداد وەك ئەوەی لەکتێبەکەی مەسعود بارزانیدا باسی لێوەدەکرێت"١١" بوییە هۆی ئەوەی کە شەر دەست پێبکات، شەرەکەش لەپێناو بەدەست هێنانی مافەکانی کورد نەبوە، بەڵکو لەپێناو خستنی دەسەلاتی قاسم و رەدکردنەوەی بریارێکی چاکسازی بوە. ئەو کاتەی ئاغاکان تورە دەبن و سەرکردایەتی حزب لەژێرەوە بەسەرۆکایەتی تاڵەبانی و گروپی هەمزە عەبدوڵاو ئیبراهیم ئەحمەد هانی ئاغاکانیان دا

تورەبن لە بریارەکەی حکومەت، چەکدارەکانی خێڵەکانی بارزان کە لە سۆڤیەت گەڕابوەنەوە لەسنووری ناوچەی خۆیان چەکیان هەڵگرتووەو پشتگیری ئاغاکانیان کردوە بۆئەوەی گورزێك بەر قاسم بدەن، رێکخیستنەکانی حزبیش لەشارەکان دژی قاسم کاریان کردەوە هەر لەو سەرو بەندەدا رۆژنامەکانی حزب دەستیانکردوە بە هێرش کردنە سەر حکومەتەکەی قاسم، بەر لە هەڵگیرسانی شەریش چ بارزانی و چ حزب هیچ پرۆژەیەکی نەتەوەیان نەبوە بیخەنە بەردەم حکومەتەکەی قاسم، لەکاتی شەرەکاندا کە ئەو پرۆژانەیان خستە بەردەم قاسم قبوڵی نەکردن، چونکە گەیشتبویە ئەو باوەری لەرێگەی فشاری چەکداریەوە هیچ پرۆژەیەکی نەتەوەی قبوڵ نەکات و هیچ دانیشتنێك لەنێوان ئەو بارزانیدا رونەدات، هەر ئەوەشی کرد و تاکۆتای هاتنی خۆشی شەری پێ باشتربووە لەگەڵ بارزانی تا رێکەوتن، بۆیە هەر لەوکاتەدا بارزانی پرۆژە پێشنیاز دەکات قاسم لێوایەك سەرباز دەنێرێتە ناوچە کوردیەکان و بریاری سەرکوتکردنی ئەو ئاغاو هێزانە دەدات لەناوچەکانی بارزان و شوێنەکانی تر دژی بریارەکەی ئەو وەستاونەتەوە و لەرێگەی کاری سەربازیەوە هەوڵی کۆتایی هێنان بەو یاخی بوونە دەدات، گەرقاسم لەبری ناردنی هێز بۆ ئەو یاخی بوونەکە نوێنەری

دیبلۆماسی بناردایە بۆچارەسەرکردنی کێشەکان بێشك ئەیلول دروست نەدەبوو یان گەر دروستیش بوایە لەسەردەمی قاسمدا روینەدەدا، هەڵەکە چەن هی پرۆژەیاساکەی تێدابوو ئەوەندەش هی ئەو بریارەی قاسمە کە ویستویەتی لەرێگەی سەربازیەوە مامەڵە لەگەڵ تورەبوونەکەدا بکات.

دیوێکی دی روداوەکە ئەوەیە کاتێك هێزەکەی قاسم دێتە کوردستان بەمەبەستی سەرکوتکردنی ئەو یاخی بوونە دێن نەك بەمەبەستی سەرکوتکردنی کورد، هێزەکەی قاسم بەهەموو ناوچە کوردنشینەکاندا تێدەپەرێت بە بێ ئەوەی دەست لەهیچ کەسێکی کورد بدات، بەڵکو ئەرکی ئەو هێزە تەنها بۆسەر چەکدارە بەرگریکەرەکان بوە نەك بۆسەر نەتەوەی کورد بە شێوەیەکی گشتی، تورەبوونی قاسم لەو چەکدارو ئاغایانەیە کە دەیانەوێت بەناوی نەتەوەیەکەوە دژی ئەو بوەستن دەبێتە هۆی روداني شەر، هەرئەمەشە وادەکات سوپا دەنێرێتە سەریان، ئیدی شەر دەست پێدەکات و وەك مەسعود بارزانی لەکتێبەکەیدا دەڵێت " بۆیان رون نیە بەتەواوەتی شۆرشی ئەیلوول کەی دەستی پێکردوە بەلاّم ١١ ئەیلول دیاری کرا"(١٢) . دەبێت ئەوەمان بیرنەچێت قاسم دژی کورد بوایە شەری لەگەڵ هەموو

داواکانی کورد دەکرد، بەلاّم دژی کورد نەبو تەنها دژی ئەو یاخی بوون و ئەوپشتێکردنەی بارزانی بوو، بۆیە مامەڵەی سەربازی هەڵبژارد و ئەم مامەڵە سەربازیەشی لەگەڵ چەکدارەکاندا بوو، نەك لەگەڵ کۆی کۆمەڵگەی کوردی، بەلاّم پارتی ئەم حاڵەتەی کردە شەری نەتەوەی کورد دژی قاسم، هەڵبەتە یەکەم شەر و یەکەم تەقە دژ بە حکومەتی قاسم ناودەنرێت شۆرشی ئەیلول، یانی پێشوتر هیچ نەخشەیەك بۆ هەڵگیرساندنی نەبوەو حزب ئەو پرۆژەیەی نەبوە شۆرشێکی دی دروست بکات، بەڵکو بریارەکەی قاسم و هاوکاریەکەی شا و روسیا دەبێتە هۆی یاخی بوون و یەکەم شەر ناو دەنرێت شۆرش و ئەو شەرەش شەری خێڵەکان بوە لەگەڵ حکومەتدا و لەسەر بنەمای نەتەوە پەرستی نەبوە، لەوەختێکدا دەبوایە حزب بەرگری لەو پرۆژە یاسایەی حکومەت بکردایەو هاوکاری جوتیارەکانی بکردایە بۆئەوەی مافی خۆیان لە زەوی و زار وەربگرن و نەچوایەتە پشت ئاغاکان، بەلاّم حزب و خێڵەکان یەکیان گرت و ئەمەیان بە هەلێك زانی و خەڵکی کوردستانیش لەژێر دروشمی نەتەوەو مافی چارەنوسی نەتەوە بە بێ هیچ تێبینی و پرسیارێك لەدەوریان کۆدەبنەوەو هێزێکی زۆر پێکدەهێنن، داواکاری ئاغاو سەرۆك خێڵەکان زۆر بچوکتر بوو

لەداوای نەتەوەیەك، کێشەکە ئەمەیە سەرکردایەتی هێزەچەکدارەکان و حزب دەرگای زۆرباشی لەبەردەم بۆوە بۆ دەرخستن وچارەسەرکردنی کێشەی کورد نەیکردوە و نەتەوەیەکی خستوەتە مەترسیەوە بۆئامانجەکانی خۆی و ئەو مەترسیە گەورانەش لەسەر داوای بچوکەوە دەستی پێکردوە، لەمەوە بۆمان رون دەبێتەوە بێ پرۆژەترین سەرهەڵدان لەمێژووی نوێماندا ئەیلول بوە، بۆیە لەکۆتایەکەشی شکستی گەورە هاتوەتە رێگەی، هەر ئەم داوا بچوکانەش وادەکات شەری گەورە روبدات و هێزەکانی ئەیلول چەن قەزاو ناوچەیەك لە سنووری سۆران لەدەست حکومەت وەردەگرێتەوەو دەکەوێتە دەست حزب. هێزەکانی قاسم هەڵدەکوتنە سەرگوندی بارزان و هەوڵی ئەوەدەدەن ئەو گوندە کۆتایی پێبهێنن، چونکە باوەریان وابوە گەر ئەو هێزەی لەگەڵ بارزانی لەو شوێنە کۆبوەتەوە کۆتایی بێت ئیدی یاخی بوونی ناوچەکانی دیش کۆتای دێت، بەلام ناتوانن ئەو کارەبکەن بۆیە دانوستاندن لەنێوان هەردوولادا رودەدات.

پاش شەرەکەی بارزان نوێنەرایەتیەکی حکومەت دێتە بارزان و لەگەڵ شێخ ئەحمەدی بارزان، کە براگەورەی مەلامستەفایە

کۆدەبێتەوە، شێخ ئەحمەد لەگەڵیان رێکدەکەوێت کە شەر جارێکی دی لەناوچەی بارزان روناداات، پاش ئەم رێکەوتنە شێخ ئەحمەد بارزانی و هێزە چەکدارەکانی جواب دەکات بۆئەوەی ناوچەکانی بارزان بەجێبهێڵن و بچنە شوێنێکی دی چونکە رێکەوتنی لەگەڵ حکومەتەکەی قاسم کردوە، پاش ئەوە بارزانی و چەکدارەکانی دێنە ناوچەی چۆمان و حزبیش رو لەوناوچەیە دەکات و دەیەکەنە پێگەی سەرکردایەتی حزب و بەپاڵپشتی رەزا شای ئێران دەست دەکەن بەجولانەوەی چەکداری دژ بە قاسم، هەڵبەتە پێش ئەم کارە چەکداریەیان کە دەستی ولأتانی دراوسێی تێکەوتوە، هەمان حزب و هەمان هێز دەیان توانی بچنە ناو حکومەت و لەرێگەی یاسا و کاری مەدەنیەوە خەباتی نەتەوەیی دەست پێبکەن، بەلأم چونکە جەنگاوەرەکان دەستی بالأیان هەبوە لەناو حزب و فەرمان رەوایی حزبیان کردوە هەمیشە لایەنی شەریان پێ باش بوە لە رێگەکانی دی، هەر ئەم مەیلی شەرەیە وادەکات کوردستان ببێتە پایەك بۆیەکلایی کردنەوە شەڕی نێوان دراوسێکان، گەر ئەو کات رێگەی سیاسی و دیبلۆماسی وەرگیرابایە بۆ مەسەلە نەتەوەیەکان نە کوردستان دەبویە مۆڵگەی شەرەکان و نە هێزەکانی عێراقیش دەبونە ئەو هێزە دڕندەیەی پاکتاوی نەژادی کورد بکەن. هەڵەگەورەکە

لەپێشا لەسەرکردایەتی کوردەوە دەستی پێکردو لە رژێمەکاندا کۆتایی پێهات. بارزانی ئەم گرت بونەوە چەکداریەی بەسەرکەوتن زانیوەو پێی وابوە شا و روسەکان پاڵپشتی بەردەوامی دەکەن و ئەو پاڵپشتیە دەبێتە هۆی ئەوەی حکومەتی عێراق لەبەردەم داواکانیدا چۆك دابدات، بەڵام هیچکام لەم خاڵانە سەریان نەگرتو هێزەکانی دەرەکی لەکۆتایەکەدا پشتیان لەبارزانی کرد و ئەرکەکەی کۆتایی هات و حکومەتەکەی قاسمیش بەهێزەکەی بارزانی کۆتایی نەهات و لەناوخۆی عێراق ئاڵوگۆڕەکان دەستیپێکرد، هیچکام لەو ئاڵوگۆڕانەش لەبەرژەوەندی بارزانی و ئەیلولدا نەبوون، خراپ خوێندنەوەی روداوەکان وایکرد بەردەوام سەرکردایەتی ئەیلول هەڵەبکەن و باجی هەڵەکانی خۆشیان لەکۆتایەکەدا بینیەوە.

گواستنەوەی هێزە چەکدارەکان لەناوچەی بارزان بۆ ناوچەی سۆران داخوازی حکومەتی عێراق و شێخ ئەحمەد بوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هێزە چەکدارەی کە لەگەڵ بارزانی بوون بەدرێژای شۆرشی ئەیلول و پاش ئەیلولیش لەهیچ ناوچەیەکی کوردستان شەریان دژی حکومەتەکانی عێراق نەکردوە گەر ئەو شەرە لەناوچەی بارزان نەبوبێت، شەری زۆزك و هەندرێن کە یەکەم

شەری بەهێزی هێزەکانی کوردە لەگەڵ حکومەتی عێراق و کراوە بە داستانی بارزانی ئەو شەرە شەری شویعیەکان و بەشێك لە بەتالیۆنەکانی ناوچەی سلێمانی پارتی بوە لەگەڵ حکومەتی ئەوکاتی عێراق، بەڵام زۆرێك لەوانەی بیرەوەری خۆیان دەگێرنەوە ئەم شەرە دەکەنە شەری تاقە حزبێك وتاقە کەسێك، لەکاتێکدا زۆری سەرکەوتنی ئەوشەرە بەدەست هێزەکانی شویعی بوەو پاشان ئەو چەند بەتالیۆنەی کە لە سنووری ناوچەکانی سلێمانی پارتی بوون و ئەوکات لە چۆمان و حاجی ئۆمەران بوون بەژداریان پێکراوە ، ئەتوانین بە پشت بەستن بە سەرچاوەکان لەوە تێبگەین هێزەکەی بارزانی هێزێك بوە تەنها ویستویەتی لەوشەرانە خۆی دەرخات کە روبەروی ناوچەکەی خۆیان دەبێتەوە، ئەو هێزەی لەگەڵ بارزانی بوە دوای گەڕانەوەیان لە سۆڤیەت هێزێکی ماندوو و پیر بوە، توانای ئەوەی نەبوە شەری گەورە بکەن تەنها لەوکاتانەدا شەریانکردوە کەزانیویانە مەترسی بۆسەر خانەوادەکەیان دروست بوە، هەروەختێك شەر رویکردبێتە بارزان ئەو هێزە چوە بۆبەرگری شەریش لەوێ دوربوبێت وەك هێزێکی خانەنشین لەدەوری بارەگاکانی بارزانی بوون، کاتێکیش ناوچەکەی خۆیان ئارام دەبێتەوە سەرجەم ئەو چەکدارانە بۆئەوەی پشێوی لەو ناوچەیە

رونەدات بەفەرمانی بارزانی دەگوازرێنەوە بۆ چۆمان ناوچەی بارزان چۆڵەکەن تاکو شەری تێدا رونەدات، تا هەرەس هێنانی ئەیلول ئەو هێزە هەر لەوناوچەیە بوون و وەك پاڵپشتیەك بۆ بارزانی لەدەوری ماونەتەوە.و رویان لە هیچ شەرێك نەکردوە لە ئەیلولدا رویدابێت، جگە لەچەند کەسێکیان وەك فەرماندە نێدراون بۆناوچەکانی رانیەو قەڵادزێ و کۆیەو هەوارامان و گەرمیان، ئیدی کۆی گشتی هێزەکە هێزێك بوە لەدەوری خودی بارەگای بارزانی نەك هێزێکی شەرکەر لەبەرەکانی شەردا.

هەرلەگەڵ گەیشتنی بارزانی و هێزەچەکدارەکانی و سەرکردایەتی حزب بۆناوچەی چۆمان ئیدی قەڵەمرەوێکی حزبی لەو ناوچەیە دروست دەبێت، لەگەڵ دروست بوونی ئەم قەڵەم رەوە حزبیە ناکۆکیەکانیش دەست پێدەکەن و بەشێکی خوێنەوارەکانی سەرکردایەتی حزب هەوڵدەدەن ئاراستەی مەسەلەکان بۆشوێنێکی دی ببەن و حزب لەدەست فەرمان رەوای خێڵ و تاقە کەسێکەوە رزگار بکەن، بارزانیش وەك سروشتی خۆی هەمیشە مەیلی دژە حزبی هەبوەو خۆشی بەسەرکردەی هەموو رەنگەکان زانیوە، پێی خۆش نەبوە وەك کارەکتەرێکی حزبی دەربکەوێت بەلاٚم لەهەمان کاتدا پێی خۆش بوە بیکەنە

سەرۆکی حزب، بەپێی ئەم حاڵەتەش کاتێك هەمزە عەبدوڵاو برایم ئەحمەد هەوڵی دروستکردنی حزب دەدەن، پێویستیان بەکەسێکی بەهێز دەبێت بۆئەوەی سەرۆکی حزب بگرێتە دەست، هەر ئەوکاتە داوا لەکاکە زیادی کۆیە دەکەن ببێتە سەرۆکی حزب بەڵام کاکە زیاد ئەم کارە قبولْ ناکات، بە بروای ئیبراهیم ئەحمەد ئەوکاتی کوردستان پێویستی بە کەسێك بوو سەرۆکی حزب بێت کەسێکی خێڵەکی و بەهێز بێت لەناو خێڵەکان،(١٣)کەچی کەکاکە زیاد لەسەردەمی سەرتای ناکۆکیەکان داواکەی بارزانی قبوڵکرد و بویە جێگری، بەر لەوەی حەبیب ببێتە جێگری بارزانی ئەو ئەرکە لەسەر شانی کاکە زیادی کۆیە بووە، ئەگەر خوێنەوارەکانی ئەوکاتە و چوار ئەفسەرە سەربازەکە لەبری ئەوەی بیر لەدۆزینەوەی سەرۆك خێڵێك بکەنەوە بۆ سەرکردایەتی حزب هەرخۆیان ئەم بەرپرسیاریەتەیان بگرتایەتە ئەستۆ رەنگە بۆئێستەی ئێمە ئاراستەکان بەجۆرێکی تر بونایە، بەڵام ئەوان ئەو بەرپرسیاریەتەیان لەکۆڵ خۆیان کردەوەو رەدکردنەوەی داواکەی کاکەزیادیش بویە هۆی ئەوەی داوا لەبارزانی بکەن ئەو کارە بخاتە ئەستۆی و ئەویش راستەوخۆ قبوڵیکرد، مەسعود بارزانی لەکتێبەکەیدا باس لەوەدەکات گوایە هەمزە عەبدوڵاو

هاوڕێکانی لەسەرداوای بارزانی هەوڵی دروستکردنی حزبیان داوەو گەراونەتەوە بۆکوردستان، پاشان هەرخۆشی دەڵێت بارزانی رقی لەحزب بوەو قەت نەیویستوە وەك کەسێکی حزبی دەرکەوێت(١٤) لێرەدا پرسیاری ئەوە دێتە رێگەمان گەر بارزانی رقی لەحزب بوو بۆ سەرکردایەتی حزبی قبوڵکرد؟ گەربارزانی ئەوانی راسپارد بۆدروستکردنی حزب بۆچی داوایان لەکاکە زیادکرد ئەوئەرکە بخاتە سەرشانی خۆی و قبوڵی نەکرد؟ گەر بارزانی حزبی نەدەویست بۆچی لەساڵی "١٩٦٤" لەسەر بەدەست هێنانی حزب و کۆنترۆڵکردنی پۆستە حزبیەکان کەوتە شەر لەگەڵ باڵی مەکەب سیاسی و بەوە تۆمەتباری کردن ئەمانە مارکسین؟ کاتێك حزبیش کەوتە بەردەستی بۆچی کەسێکی رانەسپارد سەرکردایەتی ئەو حزبە بکات و پاشان تەسلیمی کورەکان و نەوەکانی خۆی کرد؟ ئیبراهیم ئەحمەد و بەشێك لەبیرەوەریەکانی کەسانی حزبی ئەوکاتە پێچەوانەی بۆچونەکەی مەسعود بارزانی پێمان دەڵێن حزب بارزانی هەڵبژاردو حزب خوێنەوارەکان بەرێوەیان بردو پاڵپشتی بارزانیان کرد بۆئەوەی سەرکەوێت بۆئەو پلە حزبیەو هەر ناوی سەرۆکی حزبیش لەلایەن خوێنەوارەکانەوە بەخشرایە بارزانی، بەڵام هەرخۆشیان بونە هۆی لێکترازان و شەرکردن لەگەڵ ئەو سیستەمە خێڵەکیەی

کەخۆیان هێنایانە ناو حزبەوە. و بەپێچەوانەی راکانی مەسعود بارزانی پێیان وابوە بارزانی زۆر دڵخۆش بوە بەوەی هەمیشە کەسی یەکەمی حزب بێت و حزب پەژیەیەك بوە بۆ سەرکەوتنەکانی ئەو، پاڵپشتی چوار ئەفسەرەکەش لەسەرەتای حزبەوە لەرێگەی کاریگەری خوێنەوارەکانی مەکتەبی سیاسیەوە بوە نەك لەرێگەی خێڵەکانەوە، لەناو کۆی مەکتەب سیاسی هەمیشە خەونێك هەبوە حزب بێتە دەرگایەك بۆ کۆکردنەوەی هەموو رەنگەکان و بارزانی وەك سەرۆکی حزب هەوڵی کوشتنی ئەو رەنگانەی داوە و ئەم دەسەلآت گەراییەی بارزانی بوەتە هۆی لێکترازان.

وەڵێ مەسعود بارزانی لە کتێبەکەیدا باس لەوەدەکات کە" ئیبراهیم ئەحمەدو تاڵەبانی ئێرانیان لەپشت بوەو پارەکە بۆئەوان هاتوە نەك بۆ بارزانی بۆیە ناکۆکی دروست بوە"(١٥) تاڵەبانیش لەکتێبەکەی خۆیدا کە بەقەڵەمی قانیعی فەرد نوسراوە حەشا لەو پارەیەدەکات و پێی وایە ئەو پارەیە راستەوخۆ دراوەتە دەست بارزانی و لێکترازانەکەش پەیوەندی بەوە هەیە کە بارزانی تاك رەوانە بریاری داوەو ویستویەتی سیستەمێکی ستالینی پەیرەو بکات، (١٦) کێشەکە لەوە گەورەترە بتوانین لە

زمانی دوو کەسی دژ بەیەکەوە تێبگەین لێی، لێکترازانەکە پەیوەندی بە دراوسێکان و عێراقەوە هەیەو ئەم دوو هێزەی ناو حزب تەنها ئاراستەکراون و لەبەشەکانی دیدا بەوردی قسەلەسەر ئەو لێکترازانە دەکەین و و لەسەر چەمکی جاشایەتی و دروست بوونی جاشایەتی دەوەستین. لەگەڵ ئەوەی بارزانی شەری لەگەڵ قاسم کردوە شەری لەگەڵ باڵە خوێندەوارەکەی ناو حزب کردوە شەریشی لەگەڵ ئەو خێڵانە کردوە کەپێشوتر ناکۆکیان هەبوە لەگەڵ خێڵەکەی خۆی، ئەم شەرەشی بەهێزەکانی حزب کردوەو بەشەرێکی نەتەوەیی تەماشی کردوەو تەفسیری بۆکراوە.

کاتێك هێزەچەکدارەکان ژمارەیان زۆر دەبێت و ناوچەی چۆمان دەبێتە یەکەم پایەی ئەو هێزانە، ئیدی پێویستیان بەوە دەبێت ئەم دەنگی نارەزایەتی بوونە بگاتە شوێنەکانی دی، لەسەر داوای حزب رادیۆیەك لەرێگەی دوو ئەفسەری ساواکەوە دێتە ناو چۆمان و یەکەم دەنگی شۆرش بەرز دەبێتەوە(١٧) " هەڵبەتە چەمکی شۆرش بەدەستەواژە راستەقینەکە لێرەدا بەکاری ناهێنم بەڵکو بەو عادەتە بەکاری دەهێنم کە حزب بەکاری دەهێنیت" یەکەمین بانگەوازی شۆرش لەسەر بریاری ساواك لەرادیۆیەکەوە

بڵاو دەبێتەوە، پژمان لەبیرەوەرەیەکانی خۆیدا باس لەوە دەکات بەدەستی خۆی و پارەی ساواکی ئێران ئەو رادیۆیەی کریوەو هەربەدەستی خۆشی لەناوچەی چۆمان دای مەزراندوەو یەکەمین دەنگی رادیۆی نوێی ئەیلول کە رادیۆی دەنگی کوردستان بوە لەسەر ئەرکی ساواک دامەزراوە، برێك لەشایەتحاڵەکانیش ئەمە بەراست نازانن، فشارەکانی ئێران و شا لەرێگەی ئەم هێزانەی ئەیلولەوە بۆسەر دەوڵەتی عێراق بەردەوام دەبێت و لەناوخۆی عێراقیش قاسم فشاری نەتەوەپەرستەکانی عێراقی لەسەر دەبێت. ئاڵۆزیەکانی ناو عێراق دەست پێدەکەن و سوپاکەی عێراقیش لەچەند شوێنەوە بەردەوام لەشەردا دەبێت لەگەڵ هێزەکانی ئەیلول، ئەم ئاڵۆزیانەی ناو حکومەتەکەی قاسم و شەری بەردەوامی ناوچە کوردیەکان دەبێتە جێگەی دڵخۆشی شا، بۆیە فایلی ناوچە کوردیەکان بەدەست ساواکەوە دەبێت و بەردەوام هاوکاری ئەو جوڵانەوەیە دەکەن و داوا لەحزبیش دەکەن گەر چەند کەسێك بنێرێتە ئێران ئەوان رێگەیان بۆخۆشەکەن بیانێرنە دەرەوەی وڵات بۆ خوێندن. هەڵبەتە یاریەکانی شا لەم کاتەدا بۆئەوە نەبوە باوەری بەدۆسیەی کورد هەبێت بەڵکو بۆئەوە بوە ئاڵۆزیەکانی عێراق کۆتایی پێبهێنێت و سەردەمی دەولاتەی مەلیکەکانی عێراق بگەرێتەوەو عێراق

نەبێتە حکومەتێکی کۆماری وەك ئەوەی قاسم کاری بۆدەکرد، شا ئەمەی بەمەترسی دەزانی بۆ کۆتایی هاتنی سەردەمی دەسەلاّتی پاشاکان لەناوچەکە و هەموو هەوڵی خۆی دەخستە گەر بۆ دووبارەکردنەوەی حکومرانی شایەتی. حکومەتەکەی قاسم دەکەوێتە بەردەم مەترسی ناوخۆ و دەرەکی، ناتوانێت لەیەك کاتدا شەر لەگەڵ ئێران و روسەکان و نیگەرانی ئینگلیزەکان و نەتەوە پەرستەکانی ناوخۆدا بکات، ئەم لاوازیە لەسەرەتای شەستەکاندا دەردەکەوێت و نەتەوە پەرستەکانی عێراق نەخشەکەی خۆیان جێبەجێدەکەن.

بەپێی گێرانەوەی پێشمەرگەکانی ئەو کاتە پەیتا پەیتا هێزە چەکدارەکان لەناوچە قەڵەم رەوەکانی ئەیلولدا لەزۆر بوندا بوون، بەلاّم قەڵەم رەوی دەسەلاّتی ئەیلول پشکی زۆری کەوتوەتە ناوچەی سۆران و تاقە شوێنێك لە ناوچەی بادینان کەبەدەست ئەیلولەوە بوە تەنها چەند گوندێکی سنووری بارزان بوون، ئەوگوندانەش بەهۆی رێکەوتنی شێخ ئەحمەد لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی عێراق دوور بوون لەشەرەوە، حزبی شویعیش کە کەوتوەتە ناویاریەکەو بوەتە دژی دەسەلاّتی عێراق دێتە ئەو ناوچەیەو بارزانی رێگەیان دەکاتەوە وەك هێزێکی پاڵپشت لە

سنووری خۆی دایان دەنێت، بەڵام زۆر جار گوتاری سیاسی ئەم دوو هێزە جیاواز بوەو لەزۆر شوێنیشدا هەمان گوتاری سیاسیان هەبوە، رێگەکردنەوەی حزبی شویعی وەك حزبێكی ئاوارە پەیوەندی بەوە هەبوە بارزانی ویستویەتی سەرنجی روسەکان بۆخۆی راکێشێت و لەو هاوکاری کردنەی بەردەوام بن، لەروی ناوخۆشەوە بەم کارەی سەرنجی کوردەکانی راکێشاوە کە بارزانی هاوکاری نەیارەکانی دەکات و بەرەیەکی نیشتیمانی پێکدەهێنێت بۆبەرزکردنەوەی داواکانی کورد، هیچ کام لەم کارانەش کە بانگەشەیان بۆکراوە لەناوخۆدا روینەداوەو تەنها ویستویەتی روسەکان رازی بکات، مەکتەبی سیاسی پارتیش نیگەران دەبن لە کارەکانی بارزانی و هەوڵدەدەن بەرەیەکی جیاواز دروست بکەن و ئەو بەرە جیاوازە زۆربەیان لە سنووری ناوچەی رانیەو قەڵادزێ دادەنیشن، ئەم بەرەیە بەبەرەی بەرهەڵستکاری دەسەڵاتەکانی بارزانی ناسراون، نەیان ویستوە سەرۆکی حزب هەموو دەسەڵاتەکان بۆخۆی پاوان بکات و هێزەچەکدارەکان بەکار بهێنرێن بۆ سەرکوتکردنی ئاغا دەسەڵاتدارەکانی ئەو ناوچەیەو شەری خێڵەکی بخرێتە ناو چوار چێوەی دەسەڵاتی حزبیەوە، بارزانیش ئەمانەی بەمەترسی داناوە بۆسەر دەسەڵاتەکانی خۆی و ئایندەی نەوەکانی، بۆیە بێ

هیچ بیرکردنەوەیەك بەردەوام بوە لە ململانێی کردنیان و هەوڵیداوە هەمیشە دەسەڵاتیان لێ کەم بکاتەوەو بگاتە ئەو ئاستەی هەرکەسێك لەو تیمە گەر لەگەڵ بۆچونەکانی نەبێت بەدژە دین پێناسەیان بکات لەناو خەڵکدا، " بۆزیاتر شارەزابوونی خوێنەر بارزانی وەزیفەی مەلایەتی تەواو نەکردوە دوو چیرۆك هەیە بۆ پێشگری ئەم وشەیە لەپێش ناوەکەی، چیرۆکێکیان دەڵێت ئەوکاتەی بارزانی یەکێك لەسۆفیەکانی شێخ عەبدوسەلام دەکوژێت و لەسەردەمی شێخ مەحمودا دێتە سلێمانی ماوەیەکی کەم لای یەکێك لەمەلاکان دەخوێنێت و ئیجازەشی وەرنەگرتوەوە، کاتێك ئیبراهیم ئەحمەد دەچێتە لای شێخ ئەحمەد و ئاشتیان دەکاتەوە ئیدی دەگەڕێتەوە بۆناوچەی بارزان و وشەی پێشگری مەلامستەفا دەخرێتە پێش ناوەکەی(١٨) چیرۆکەکەی دی دەڵێت لای برێك لە بەرزانیەکانی ئەو سەردەمە وشەی مەلا بەمانای جێگرەوە هاتوە(١٩) هەڵبەتە تاکو ئەم چرکەیەش لەناو بارزانیەکان مەلا بوونی نیە، چونکە خانەقاکەی ئەوان لەسەردەمی شێخ ئەحمەدەوە دەرزی مەلایەتی تیا نەوتراوەو شێخ ئەحمەد سێ ریفۆرمی ئاینی لەناو تەریقەدا کردوە، یەکیان ئەوەیە حەج ناکرێت و رۆژو ناگیرێت و نوێژ ناکرێت، ئەم سێ ریفۆرمە برێك بۆئەوەی دەگەڕێنەوە کەشێخ

ئەحمەد خانەقای کردوە بەشوێنێك بۆ خزمەتی خێڵ و لەبری وەلا بۆ ئاین وەلا بۆ خێڵ دروست بوە، برێکیدیش لەبەڵگەنامەکانی بەریتانیادا باس لەوەدەکەن شێخ رێکەوتنی هەبوە کە وەزیفەی ئاینی ئیسلام لەژێر قەڵەم رەوی خۆی کاڵ بکاتەوە(٢٠)" . هەرئەمەشە وادەکات شێخ گۆشتی بەراز حەلاڵ بکات کە لەناو ئیسلامدا حەرام بوە، شێخ ئەحمەد بەکەم کردنەوەی.ئەم ئەرکانە لەسەر سۆفیەکانی خۆیان ئەرکی خێڵەکی و چەکداری پێبەخشیون و لەبری خزمەتکردنی ئاین خزمەتی خێڵ و داواکانی خستوتە شوێنیان، نەیویستوە تەنها دیوە ئاینیەکە ئەرکی ئەوان بێت و ئەم وەلائەی لەئاینەوە گواستوەتەوە بۆکایەی سیاسی و خێڵەکی، بۆیە بەردەوام زیاد لە "٥٠٠" چەکداریان ئامادەبوە بۆپشتگیری کردنی هەر یاخی بوونێك کەلەوناوچەیە رودەدات.

ناکۆکیەکانی ناو حزب دەست پێدەکەن و لەناو عێراقیشدا ناکۆکیەکان زیاد دەبن و نەتەوە پەرستەکانی عێراق کۆدیتایەك بەسەر قاسمدا دەکەن و دەیکوژن، ئەم کۆدیتایە دەبێتە دەروازەیەك بۆهاتنی تیمێکی دی بۆسەر دەسەلآت، لەناو خۆی کوردستانیش حزب بریاری بەستنی کۆنفرانسێك دەدات و تیمی

مەکتەبی سیاسی بیر لەوەدەکەنەوە سەراپای حزب بۆگۆڕن و دەسەڵاتەکانی بارزانی لەم کۆنفرانسەدا کەم بکەنەوە.

بارزانیش بەمە رازی نابێت و بیانو لەمەکتەب سیاسی حزب دەگرێت بە سەرچاوەی کێشەکەیان تەماشادەکات، بۆیە مەیلی ئاڵوگۆڕکردن دەکات لەناو هەیکەلەی حزبدا، ئیدی ئەو مەیلە بەهەر رێگەیەك بێت بۆئەو گرنگ نیە، شانسی سەرکەوتنیش زیاتر لای بارزانی دەبینرێت، یەکەم پالپشتی دراوسێکان لەو کراوەو شەرەکانیش هەمووی بەدەستکەوتی ئەو تەفسیر کراون، لەناوخۆی حزبیش دەرکی بەوە کردوە سەردەمی شەرە بۆیە هەموو شوێنە سەربازیەکانی بە هەوادارانی خۆی کۆنترۆڵکردوە و هەناسەیەکی نەهێشتوەتەوە بۆحزب و خوێنەوارەکان، لەئەنجامیشدا کۆنترۆڵەکە لای ئەو دەمێنێتەو میلەتێك دەبێتە قوربانی شەری دوو تاقم.

# تیرۆرکردنی کەسایەتی کورد

پاش ئەوەی لەبەرواری ٩_١_١٩٦٠ پارتی دیموکراتی کوردستان داوای مۆڵەتی رەسمی لەحکومەتکردو پاش (٤٠) رۆژ مۆڵەتەکەی وەرگرت(٢١) یەکەم هەنگاوی ئەم حزب جگە لە کاری سیاسی لەشارەکانی دی و دەرکردنی رۆژنامەیەکی کوردی، لەسنووری ناوچەی شەقلاوە دەستیکرد بە تیرۆرکردن و کوشتنی ئەوکەسایەتیانەی کەبەلای حزبەوە جێگەی نیگەرانی بوون، هەڵبەتە یەکەم کوشتنی پارتی لەشەقلاوە سەری هەڵداو لە مانگی ٢ هەمان ساڵدا "سدیق میران" یان تیرۆرکرد(٢٢)، کێشەی ئەم حزبە لەسەرەتاوە تاکو ئێستە ئەوەیە هەمیشە لەکاتی تیرۆرکردنەکان و ئەنجامدانی کارەکەیدا دانی بەوەدا نەناوە ئەو کارەی ئەنجام دابێت، نەیتوانیوە خۆی بکاتە خاوەنی کارە خراپەکەو ویستویەتی ئەو دیوە ناشیرینەی دەرنەکەوێت، بۆیە گەربمانەوێت خوێندنەوە بۆتیرۆربکەین لە سەردەمی مێژووی نوێدا لەم ناوچەیە دەبێت خوێندنەوە بۆ پارتی بکەین، پارتی یەکەمین حزبە لەگەڵ دروست بوونی خۆیدا تیرۆریش دروست دەکات، پاشان لەرێگەی کاری کۆمەڵایەتیەوە هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو تیرۆرەدەدات ئەنجامی داوە، بەبێ

تێگەیشتن لە پارتی لەسەرەتاکانی دەست پێکردنیەوە ناتوانین لەسەرتای تیرۆریش تێبگەین، تێگەیشتن لەپارتیش بۆخۆی تێگەیشتنە لەو تیرۆرە نوێیەی کە ئەو حزبە بەرهەمی هێناوە، بەشێکی کوشتنی ئەم کەسایەتیانە دەگەڕێتەوە بۆ تورەبونێکی خێڵەکانی بارزان لەم کەسە کە پێش دروست بوونی حزب پشتگیری ئەو خێڵانەی کردوە دژی بارزانی و خێڵەکەی بوون، یان جیاوازیەکی بیرکردنەوەو دەرخستنی ئەو جیاوازیە بوەتە دەرگایەکی مەترسیدار لەسەر ژیانی ئەو کەسەی بەجۆرێکی دی بیری کردوەتەوە، هەرچۆن لە ئێستەدا جیاوازی بیرکردنەوە لەسنووری ئەو حزبەدا مەترسیە بۆسەر ژیان لەسەردەمی ئەیلولدا ئەو مەترسیە قورسترو خێڵەکیانە تربووە، چونکە ئەیلول بەرهەمی نەخوێنەوارەکان و خێڵە میلیشیاکان بوو، بەشێکی دیش ئەم کوشتنە دەبەستنەوە بەناکۆکیەکانی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ ئەم کەسە حزب حەقی بەخۆی داوە لەسەرجیاوەزیەك کۆتایی بەژیانی کەسێك بهێنیت، بەدیوێکی تردا ئیدی مەترسیەکە تەنها لەبازنەی خێڵدا خۆی نمانەدەکرد بەڵکو تەشەنەی کردوە بۆئاستێك کە تایپێکی سیاسی وەرگرتوە، پاش ئەوەی بەرگێکی سیاسی بەسەر روداوەکاندا دەدرێت هەموو ئەوانە کەوتونەتە مەترسیەوە جیاواز بوون لەم

دوو بازنەیە، لەهەموو حاڵەتێکدا یەکەم گوللەی حزب روبەروی ئەوکەسانە نەبوە کە دژی کورد جەنگابوون پێشوتر بەڵکو یەکەم گوولەی حزب بۆکوشتنی کوردێك تەرخان کرا. ئەم کوشتە دەبێتە سەرتایەك ئیدی حزب چ وەك خۆی چ وەك بارزانی دەست بکات بە تیرۆرکردن و لەناو بردنی ئەو کەسایەتیە مەعنەویانەی لەناوچەکاندا سەریان هەڵداوەو لەروی مەعنەویەوە کاریگەریان هەیەو مەترسین بۆئایندەی دەسەڵاتی حزب و بارزانی.حزب هەم دادوەر بوە هەم بکوژ.

هەر لە ساڵی ١٩٦٠ لە مانگی_ ٥_ کۆنگرەی حزب دەبەسترێت و لەو کۆنگرەیەدا کە بارزانی خۆی ئامادەیی تیایدا دەبێت ناکۆکیەکانی حزبی شویعی و پارتی دەست پێدەکەن و لەسەر رێنمایی بارزانی دژایەتی کردنی حزبی شویعی لەناو پارتی سەر هەڵدەدات(٢٣) ناکۆکیەکانی حزب لەگەڵ حزبی شویعی پەیوەندی بەو بارە سایکۆلۆژیەی بارزانی و هاورێکانیەوە هەیە کە تازە لە ولاتی رۆسیا گەراونەوەتەوەو دیدێکی توندیان دەبێت لەسەر هەر کەسێکی شویعی، بارزانی پێی وابوە هەموو شویعیەك بەشێکە لەدەسەلاتی روسەکان و لەهەمان کاتیشدا خۆی بەردەوام لەرێگەی قونسوڵەکانەوە پەیوەندی لەگەڵ

روسەکان هەبوە، کەچی لەناوخۆی عێراق و کوردستان دژی شویعیەکان بوەو سیستەمی کۆمۆنیستی بە سیستەمێکی خراپ تەماشاکردوە، ئەم دیدەی بارزانی و هاورێکانی لەسەر شویعیەت لەناو حزبیش رەنگ دەداتەوەو ناکۆکیەکان دەست پێدەکەن و بۆشایەك دەگەوێتە نێوان گوتاری هەردوو لادا، لەبری ئەوە بارزانی خێڵ دەکاتە پایەی سەرەکی حزب و ئەو دیدە چەپەی کەلەناو حزبدا دەبێت روەو کاڵبونەوە دەبات. هیچ گوتارێك جگەلە لەگوتای خێڵەکەی و مەیل بۆبارزانی نەیتوانیوە ئیدامە بەمانەوەی خۆی بدات، مەگەر ئەو گوتارە بەنهێنی بوبێت یان هەڵهاتبێت بۆشوێنێك ئەیلول و تفەنگەکانی دەستیان نەگەیشتبێتێ، دەیان نمونەی هەڵهاتن لەو سەردەمەدا لەناو سەرچاوەکاندا هەیەو پیشانمان دەدەن هەرکارەکتەرێك و تاقمێك بۆئەوەی مانا بەمانەوەی خۆیان بدەن لەو قەڵەم رەوەدا دەبوایە دەست لەبۆچونەجیاوازەکانی خۆیان هەڵگرن و بچنە سەر ئەو گوتارەی بارزانی و حزبەکەی بانگەشەیان بۆکردوە، نزیکترین کەسیش لەبارزانی ئەو کەسەبوە باشترین "بەڵێ "ی ئەنجام داوەو هەرگیز ئینکاری لە بۆچونێکی نەکردوە.بارزانی لەوکاتانەدا کە بەرزترین دەسەڵات بوە تەنها رقی لە جیاوازیەکان و لە شویعیەکان و لە خوێنەوارەکانی ناو حزب نەبوە، بەڵکو رقی

لەهەموو ئەوانەبوە لەدەرەوەی ئیرادە و دەسەڵاتی ئەو خەونی تریان بنیوە، هەر ئەم حاڵەتە سایکۆلۆژیەی بارزانی وا لەحزب دەکات ئیدی ماناراستەقینەکەی خۆی لەدەست بدات و حزب نەبێتە وەسیلەیەك بۆ کرانەوەی دەرگای دی بۆ میلەت بەڵکو ببێتە وەسیلەیەك بۆ بەدەست هێنانی زۆرترین دەسەڵات لای خێڵێك چەند تاقمێك.

هەر لەگەڵ ئەوەی کە ناکۆکی حزبی پارتی و شویعی بەتەواوەتی دەستی پێکرد لە مانگی" ١١ _ ١٩٦٠ ". لەیادی بیرەوەری شۆرشی روسیادا بارزانی چوە روسیاو ماوەی دوومانگ لەوێ مایەوە و چاوی بە خرۆشۆف کەوت(٢٤) ئەم سەفەرەی بارزانی پایەکی بەهێز بوو بۆ پشتگیریکردنی سۆڤیەت گەر روداوی سەرهەڵدان دروست ببێت، برێك لەمێژوونوسەکان پێیان وایە کاتێك شا بریاردەدات هاوکاری بارزانی بکات دژی قاسم شەر هەڵگیرسێنیت یەکێك بوە لەسەرچاوەکانی دروست بوونی ئەیلول، سەرچاوی دووهەم پەیوەندی بەو دیدارەی خرۆشۆف و بارزانیەوە هەیە کە ئەوانیش هاوکاریان کردوە بۆئەم کارەو ئێرانیەکان لەم هاوکاریە ئاگادار نەبون تاکو ئەوکاتەی "عیسا پژمان " وەك ساواکێك ئەم هاوکاری کردنە ئاشکرا دەکات.

لەگەڵ گەڕانەوەی بارزانی بۆعێراق، دەرکی بەوە کردوە قاسم لەم سەردانەی ئەو نیگەرانە، بۆیە چەندین جار هەوڵیداوە قاسم ببینێت و دڵنیای بکاتەوە لەوەی خیانەتی لێناکات، بەلاّم قاسم بەو دیدارە رازی نەبوە، چونکە لەرێگەی دەزگا نهێنیەکانی حکومەتەوە لەوە تێگەیشتبوو ئیدی بارزانی دژی ئەو کاردەکات و ولاّتە نەیارەکانی عێراقیش هاوکاری دەکەن، بارزانیش کەدەزانێت قاسم لێی نیگەرانەو توشی کێشە دەبێت بە شێوەیەکی کتوپر بەغداد بەجێدەهێڵێت و دەچێتەوە ناوچەکەی خۆیان لەبارزان. ئەوکاتەی بارزانی دەچێتەوە بارزان شەری زێبارییەکان و بارزانیەکان دەستی پێکردوەتەوە.

ئەم سەردانەی بارزانی بۆسۆڤیەت کەمێك لەناکۆکیەکانی پارتی و شویعی لاواز دەکات بەلاّم کۆتای پێناهێنرێت و بەردەوام دەبێت تائەوکاتەی هەردوولا دژی قاسم دەوەستنەوە، لەمانگی" ١ ی ١٩٦١" بارزانی گەرایەوە بۆ کوردستان و جموجوڵەکانی دەستیان پێکرد، لە مانگی" ٣ " هەمان ساڵ رۆژنامەی خەباتی پارتی لەبەغداد داخرا(٢٥) هەر لەم مانگەدا لەنێوان بارزانیەکان و زێبارییەکان شەرێکی قورس دەستی پێکردو زێبارییەکانیان راونا بۆ تورکیا(٢٦) ئەم شەرە پەیوەندی بە شەری نەتەوەییەوە

نەبوو، بەڵکو شەڕێك بوو لەسەر بنەمای شەرە خێڵەکیەکانی ئەو کات دووبارە بوەتەوە، ئیدی بارزانی بەغدای بەجێهێشتو گەراوەتەوە ناوچەکانی خۆی و چەکدارەکانی کۆکردەوە، ئیبراهیم ئەحمەد و هاورێکانیش چونەتەوە سلێمانی و هەوڵی کۆکردنەوەی چەکداریان داوە دژ بەقاسم.داخستنی دەرگاکانی حزب و رۆژنامەی خەبات کە ئۆرگانی پارتی بوو بەفەرمانی حکومەت، لەسەر بنەمای ئەوە بوە کە ئەورۆژنامەیە بەفەرمانی بارزانی دەستیکردوە بەهێرشکردن بۆسەر حکومەتەکەی قاسم تا کەشێك بخولقێنێت ناکۆکی دروست بێت لەنێوان هەردولاداو بیانوێك بەدەست بارزانیەوە بێت بۆ دەستپێکردنی شەری چەکداری، قاسمیش ئەوەی بەدەستی بێگانەکان زانی و راستەوخۆ دژی ئەو هێرشکردنە وەستاوەو رۆژنامەکەی داخستوە، ئیدی پاش ئەمە سەرکردایەتی حزبیش دێنەوە کوردستان و ئەو زەمینەیەی بارزانی ویستویەتی سازکراوە بۆ دەست پێکردنی کارەکەی. لەگەڵ داخستنی ئەو رۆژنامەیە بەشێکی زۆری رۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکانی ئەوکاتیش داخراون.

یەکەم کاری بارزانی کە گەڕایەوە بۆناوچەکانی خۆیان هێرشێکی توندی بردە سەر زێبارییەکان و زێبارییەکانیان ناچار کرد بەرەو ناوچەی تورکیا هەڵبێت(٢٧) لەگەڵ کۆتایی هاتنی ئەم شەڕەو شکستی زێبارییەکان هێزەچەکدارەکان خۆیان ئامادەکرد بۆشەڕێکی دی، پاش ئەمە کە حزب پایەی خۆی بەهێزکرد و بارزانی دەسەڵاتەکانی وەرگرت دەستکرا بە پاکسازی کردنی ئەو کەسانەی کە لای بارزانی جێگەی نیگەرانی بوون، یەکەم شەڕی ئەیلولیش لەنێوچەی بازیانی ناوچەی سلێمانی لە "١١_٩_ ١٩٦١" سەری هەڵدا(٢٨) . هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی شەڕەکەو وەرگرتنی یارمەتی دەرەکی، بەعسیەکانی ناو عێراقیش دەرکیان بەو درزە کردوە لەعێراقدا دروست بوەو دەستیان کردوە بە دارشتنی نەخشەی خۆیان، بیریشیان لەوەکردوەتەوە سودێك لەبارزانی ببینن بۆیە پاش ساڵێك بەعسیەکان قەرەنی ناوێکیان ناردە لای بارزانی هاوکاریان بکات بۆئەوە کۆدیتابکەن و قاسم بروخێنن حەقی کورد دەدەن بارزانیش بەمە رازی بوو(٢٩). ئەم رازی بونەی بارزانی پەیوەندی بەوە هەبوو ئەگەر ئەم حزبە بێتە سەردەسەڵات ئەو حەقانەی بارزانی داوایان دەکات لەرێگەی ئەم حزبەوە بەدەستی دەهێنن، هێزەکانی ئەوکاتەی ئەیلولیش ژمارەیان گەیشتبویە

"٧" هەزار چەکدار(٣٠). گەر بارزانی ئەم هاوکاریەی رەد بکردایەتەوە و رێکەوتنێکی لەگەڵ قاسم بکردایەو قاسمی لەو کۆدیتایە ئاگادار بکردایەتەوە ئاراستەکە بۆشوێنێکی دی دەچوو، بەڵام چونکە بارزانی و حزبەکەی بە پاڵپشتی روس و ئێران ئەم هەنگاوەیان نابوو، نەیان دەتوانی ئەوکارە بکەن و بۆهەردوو وڵاتی هاوکاری پارتی مەبەست بوو کە قاسم بروات و مەترسی لەسەر بەرژەوەندیەکانی ئەوان نەمێنێت.

ئەگەر ورتر تەماشای ئەم روداوانە بکەین ئەو عەقڵە ئێرانی و روسیە دەبینین لەپشت هەنگاوەکانەوە، ئەو ، ئیرادەیەش لەکوردستاندا بۆ سەرهەڵدان دروست بووبوو بێئاگا خۆی خستبویە ناو ئەو گۆماوە، رەنگە ئەیلول بەشێکی بچوکی پەیوەندی بە هەڵسانەوەی ئیرادەی تاك بووبێت، بەڵام بەشە گەورەکەی پەیوەندی بەکوشتنی ئەو ئیرادەیەوە هەبووە، چونکە میلەتێك ئامادەکراوە بەس بۆشەرو پڕچەکردن و ململانێی خێڵەکی، هەڵسانە سەرپێیەکەشی لەپێناو خۆیدا نەبوە لە پێناو ئەو نەخشە دەرەکیانەدا بوە کە پێیان باشبوە روداوێك لەناوچەکەدا رودبدات بەس خۆیان راستەوخۆ لەناو روداوەکە نەبن هێزێك ئەو روداوە ئەنجام بدات کە بەشێکە لەناوچەکە ئەو

هێزەش کورد بوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەیلول هەموو ئەو رەنگانەی سریوەتەوە کە لەدەرەوەی ئیرادەی حزب بوون. تاك رەنگی یەکێك بوە لەخەونەکانی ئەیلول، یان باشتر بڵێین خەونەکانی بارزانی، ئەم تاك رەنگیە دەبێتە یەکەمین ناکۆکی ناوخۆی حزب و هەر ئەم تاك رەنگیەشە لێکترازانەکان دروست دەکات، لەپێناو پاراستنی دەسەلاتی تاك رەنگی و خێڵدا ئیدی حزب جگە لەوەی دەبێتە شوینێك بۆ بەرهەم هێنانی جەنگاوەری چەکدار دەبێتە شوێنێکیش بۆکوشتنی ئەوانی دی کە لەدەرەوەی حزبن یاخود حزب و بارزانی بونیان هەیە. هاتنی بەعسیەکان بۆسەرحوکم و شەر راوەستاندنی بارزانی لەو فەترەیەدا مەکتەبی سیاسی تەواو نیگەران دەکات، لەگەڵە ئەوەشدا هێزەکانی ئەیلول لەناوچەکانی ژێردەسەلاتی خۆیاندا دەست دەکەن بە ئازاردانی ئەو کەسانەی لەدەرەوەی حزبن و بەتۆمەتی جیاجیا خەڵك دەکوژن و زیندانی کردن و ئەشکەنجەدان دەست پێدەکات، گرنگە ئەوەش بڵێین پێش دروست بوونی بەعس و زیندانەکانی لەسەرتای ئەم سەدەیەدا ئەیلول یەکەمین زیندان و یەکەمین ئەشکەنجەی دەست پێکرد، بەپێی گێرانەوەی زیندانەکانی " ڕایات" ئەوەی لەرایات رودەدات هەمان ئەو فۆرمەیە کەلە زیندانەکانی بەعس لەپاشتر رودەدەن. زیندانی رایان گەورەترین و مەترسیدارترین زیندانی

سیاسیە لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیەوە کوردی تێدا زیندانی دەکرێت و ئازار دەدرێت، یەگوێگرتن لەوکەسانەی ئەم زیندانەیان بینیوە حاڵی دەبین لەناو ماهیەتی ئەیلولدا ستەمکارێکی گەورە بوونی هەبوە، ئەو ستەمکارە هەرجارەو بەفۆرمێك خۆی دەرخستوە، ترسناکترین هەنگاوی ئەو ستەمکارە لەزیندانی رایاتدا خۆی دەرەخات و دەبێتە نمونەیەك بۆ دەسەلأتەکانی پاش خۆی لە عێراقدا.

هەر لەسەرەتاکانی ساڵی شەستەکان پارتی کۆمەڵێك بەرپرسی حزبی دیموکراتی ئێران کەلەگەڵ ئاغای "سلێمانی موعینی و مەلا ئاوارە " دەبن تەسلیم بە دەسەلأتی ئێران دەکاتەوە ( ٣١). چیرۆکێکی دی کوشتنی ئەم گروپە شۆرشگێرە باس لەوەدەکات تەسلیم نەکراونەتەوە راستەوخۆ لەسەر داوای ئێران پارتی کوشتونی، ئەم گروپەی پارتی لەناویان دەبات پێشوتر زیندانی سیاسی دەبن لەئێران و بەبریارێکی شاهانە ئازاد دەکرێن و دێنە باشوری کوردستان بۆ خەباتی سیاسی، جموجوڵەکانیان دەسەلأتدارانی ئێران نیگەران دەکات و بەهاوکاری پارتی دەستگیر دەکرێن و رەوانەی ئێران دەکرێن، ئەمانە یەکەمین هەنگاوی تەسلیم کردنەوەی کەسی کوردە بە رژێمەکانی دی

لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندی دەسەڵاتی ئەوکاتی ئەیلول، لەم چرکەساتەدا بۆمان رون دەبێتەوە ئەیلول شۆرش نەبوە بەمانا فراوانەکەی بەڵکو بەرگریەکی پەرچەکردار بوە، شۆرش ناتوانێت بیر لەوەبکاتەوە کوردێکی خەبات گێڕ تەسلیم بەهێزێکی دی بکاتەوە، ئەم کردەوانە هەمیشە ئەو هێزانە دەیکەن شەر بۆئەوە دەکەن بگەنە دەسەڵات نەك شەر بۆئەوە بکەن ئازادیەکانی کەسەکانی دی بەدەست بهێنن، راستە لە ژێر دروشمی ئازادیدا هەنگاوەکانی خۆی دەنێت، بەڵام لەپشت دروشمەکانەوە هەمیشە ئەو کارانە دەکات ئازادیەکانی ئەوانی دی دەبەستێتەوە بە بەرژەوەندیەکانی خۆیەوە، یەکێك لەگوتارە بەهێزەکانی شۆرش پاراستنی ئازادیەکانی هەموانە، بەڵام کاتێك خۆی بویە مەترسی بۆسەر ئازادیەکانی ئەوانی دی، ئیدی ئەو هێزە لەبەرگی شۆرشگێری رادەماڵدرێت و دەچێتە خانەی بەرگریکردن لەخێڵ و بەرژەوەندیەکانی گروپێك، تەسلیمکردنەوەی ئەم گروپە شۆرشگێرە بەخاڵێك دادەنریت کە بەراستی سەرکردایەتی ئەیلول خزمەتێکی راستەقینەیان بەدەسەڵاتی ئەوکاتی ئێران کردەوە، نەیان هێشتوە لەدەرەوەی ئیرادەی ئێران هیچ جموجوڵێکی کوردانە روبدات و پەیوەندیەکانی ئەوان تێکبدات. ئەم لۆژیکە تاکو ئێستەش لەناو

حزبی کوردیدا بوونی هەیە، کە ڕێگە لەخەباتی سیاسی حزبێکی دی بگرێت و بەرژەوەندی حزبی لاگرنتگتربێت لەبەرژەوەندی نەتەوەیی، لەم سیاقەدا ئەتوانین دەرك بەوەبکەین چەمکی خەبات و سەروەری و ئازادی تەنها لە بازنەی دروشمدا خۆی دەردەخات، نەك باوەڕی حزب بێت کار لەسەر ئەم چەمکانە بکات و مانای گەورەیان بداتێ، بە مانایەکی دیش ئەمە نەك تەنها ڕێگریە لەئازادیەکانی ئەوانی دی بەڵکو خیانەتە لەو چەمکانەی بەرزکراونەتەوە لەو دۆخەی حزب بانگەشەی بۆدەکات.

دەبێ ئەوە بزانین لەسەردەمی ئەیلولوە واتە لە ساڵی ١٩٦١ تاکو ساڵی ١٩٩١ کە ئەو ساڵانە بەساڵی شۆرش ناودەبرێن (٨) هەزار گوندی باشوری کوردستان لەناو چوون و یەك ملیۆن کورد کوژراون و (٤) ملیۆنیش ئاوارە بوون(٣٢) ئەم ساڵانە بۆکورد ساڵانی کوشتن و خوێن بوو، بەشێکی زۆری ئەو کوشتنانەش لەسەر ئەو بنەمایە رویاندا کە سەرکردایەتی حزبەکان کە بەسەرکردایەتی شۆرش خۆیان دەردەخست هەڵەی مەزنیان دەکرد، هەر لەیەکەم هەنگاویانەوە لەبری ئەوەی پشت بە ئیرادەی هاونیشتیمانیانی کوردستان ببەستن بۆ دەستبەکار

بوونی خۆیان پشتیان بە دەوڵەتەکانی دراوسیێ بەست، بەحوکمی ئەوەی پارتی وەك یەکەمین حزب لەم سەردەمە دەستی پێکرد یەکەمین هەڵەش لەوە دەست پێدەکات، ئەم حزبە هەر لەسەرەتاکانی دروست بونیەوە تاکو ئەم چرکەساتەش هەرگیز نەیتوانیوە بە بێ پشتگیری کردنی دەوڵەتێکی دراوسێ یەك هەنگاوی شۆرشگێرانە بهاوێت، بەردەوام ئەوکارانەی کردوە کە ئاراستەیان کردوە حزبێکی ئاراستە کەر نەبوە و ئاراستەکراو بووە، مۆدێلێکی دروستکرد کە خراپترین مۆدێلی حزبایەتی بوو، خۆی لەسەر بنەمایی مۆدێلە ستالینیەکە هاتبویە بوون، پاشان کردیە مۆدێلێکی خێڵەکی و خێڵی لەفۆرمە کۆمەلآیەتیەکەوە گواستەوە بۆ فۆرمی حزب و هەموو ئەو سیتەمانەی هەڵوەشاندەوە کە لەناو حزبدا بوونی هەبوو، چەق بەستنی حزب لەسەر یەك رەنگ و یەك مۆدێل کاریگەری خراپی کردە سەر کۆی دروست بوونی حزب لە باشوری کوردستان، چونکە ئەوەی حزبی دروست دەکرد یان لە بازنەی ململانێکانی حزبی دیەوە دەهاتە دەر یان لەپەرچەکرداردا دروستی دەکرد، بۆیە یەك قوتابخانەی حزبی بەرهەم هات کە ئەویش قوتابخانەی خێڵە بە فۆرمە سیاسیەکەی. ئێمە ناتوانین بڵێین دروست بوونی حزب هوشیاری کۆمەڵگەی گۆڕیوە، حزب کتێبێك نەبوە بۆ

دروستکردنی هوشیاریەکی نویٚ لەو هوشیارەی کە کۆمەڵگە هەیەتی، حزب هەمان خێڵبوە بەدەسەلاٚتی زیاتر و دروشمی زیاترەوە، تاقە خزمەتکاری خێڵ پاش ئینگلزەکان خودی حزبە، بەردەوام لەبری ئەوەی حزب عادەتی نویٚ دروست بکات و عادەتە کۆنەکان بسرێتەوە خۆی چوەتە سەر عادەتەکۆنەکان و ئەومیراسە نوێیەی هەیبوە بەخشیوەیەتی بە عادەتەکانی خێڵ، بۆیە بوەتە بەشێك لەعادەتەکانی خێڵ و جاری واش بوە دیدی حزبی ئەوەندە لاواز بوە بەشێکی بچوك بوە لە دیدەکانی خێڵ. بۆیە حزب لەم ناوچەیە نەبوەتە زەرورەتێکی گرنگ و هەمیشە پاشکۆی خێڵ و بیرکردنەوەی خێڵەکی بوەو دنیایەکی نوێی نەخستوەتە سەر دنیا کۆنەکە.

بە رویەکی تردا گوتاری سیاسی ئەم مۆدێلە حزبیە لەسەرتاکانەوە تاکو ئێستەش لەیەك چوار چێوەدا گیرۆدە بوە، ئەو چوار چێوەیش بریتیە لەرەعیەت بوونی کەسی حزبی بۆسەروی خۆی و بە خراپ تەماشاکردنی ئەوانەی دەرەوەی خۆی، جگەلەمەش خیانەت و هەنگاوە هەڵەکان بکرێنە دەستکەوتی گەورەو ناشیرینەکان و خاڵە رەشەکان بازیان بەسەردا بنرێت، شەرعیەت دان بەخۆت و سرینەوەی ئەوانی

دی، هەموو ئەم گوتارانە بونە یەکەمین کۆڵەکەی ناکامڵی کۆمەڵگەیەکی پەرتەوازە، کوشتن و لەناو بردنی کورد بەدەستی کورد یەکێك لەمەترسیدارترین هەنگاوەکانی ئەم فۆرمە حزبیەبوو، کەتا ئێستەش لەسەر ئەو هەنگاوانە بەردەوامی هەیەو دەسەلاّت بەخۆی دەدات کەسێکی دی بسرێتەوە تەنها لەبەر ئەوەی بۆچونەکانی جیاوازن لەم، ئەم دیدە سۆڤیەتیە رەگوریشەکانی دەگەرێنەوە بۆ ئەیلول. بەرزکردنی کەسی نەخوێنەوار و کاڵکردنەوەی کەسی خوێنەوار بنەما بنەرەتیەکانی خێڵ و ئەیلولە، ئەوانەی ئاراستەی ئەیلول دەکەن خوێنەوارەکان نین بەڵکو ئەو نەخوێنەوارانەن حوکمی بیرکردنەوەیان هێندەی حکومی لولەی تفەنگەکانیانە، کاتێك ئایندەی میلەتێك دەکەوێتە دەست ئەم جۆرە کەسانە هەڵبەتە روناکیەك نایەتە رێگەو بەردەوام شکست زۆر تردەبێت لە هەڵسانەوە. لەمێژووی ئەو چەند ساڵەدا نابینی سیاسەت بەمانا فراوانەکەی ئەنجام درابێت، بەڵکو سیاسەت هەمیشە بەو فۆرمە خۆی نمایشکردوە کە خراپترین دیویی ژیانە، جەنگ و کوشتن و کەرامەتی خێڵ و ستایشی سەرکردەکان شوێنی سیاسەتی گرتوەو هەڵە لەدوای هەڵە رویداوە، میلەتیش لەئاستی خوارەوە باجی ئەو هەلاّنەی داوە جەنگاوەرانی شەر ناویان ناوە

سیاسەت، جەنگاوەرەکانیش کوری ناو خێڵەکان بوون نەك کوری ناو قوتابخانە جیاکانی سیاسەت، بۆیە هەمیشە بەدیدە خێڵەکیەوە تەماشای روداوەکان کراون و ئەنجامەکەشی ئازاری لەگەڵ خۆی هێناوە.

هەر ئەو بنەما خێڵەکیە دەبێتە دەرگایەکیش بۆ جیابونەوەی خێڵەکان، کاتێك خێڵ دەست بەسەر حزب دەگرێت و ناکۆکیەکانی رابردوی خۆی دەباتە ناو سیاسەتەوە ئیدی ئەو خێڵانەی دی کە دژی ئەم خێڵەن رێگەی تر دەگرنە بەر، چونکە لەناو حزب و ئەیلولدا رێگەیان نابێتەوەو دەروازەی پشتگیری کردنی دەسەلات دەکەنە شوێنی پاراستنی خۆیان، بۆیە لە ساڵی "١٩٦١" خێڵەکانی هەرکی و لەولان و برادۆست و رێکانی (٣٣). دەچنە پاڵ دەسەلات و شەرە کۆنەکانی خێڵەکەیان لەگەڵ بارزانیەکان دەگوازنەوە بۆشەری خێڵ لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەیلول، ئیدی حزب نەیتوانیوە وەزیفە راستەقینەکەی خۆی ببینێت و ببێتە چەترێك بۆکۆکردنەوەی هەموو رەنگەکان، لەبری ئەو خێڵی بارزان هەم دەبنە حزب و هەم دەبنە دەسەلات، بۆیە لەرێگەی حزبەوە شەرەکۆنەکانی خۆیان دەست پێدەکەن لەگەڵ ئەو خێڵانەی پێشوتر ناکۆکیان هەبوە لەگەڵیان و چەمکی

خەبات گێڕو جاش دێتە ئاراوە، هەرخۆیان ناو لەشتەکان دەنێن و کۆمەڵگەش باوەر بەم ناو لێنانە دەکات، لەکاتێکدا خەباتگێر ئەوکەسە نیە خۆی خەباتەکەی بەپشتی هێزێکی دەرەکی بکات و ئەوانەش بە خیانەت تۆمەربار بکات کە لەگەڵ هێزێکی تردان، خەباتگێر ئەو هێزەیە هەوڵدەدات ببێتە چەتر بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین ڕەنگ، نەك ئەو هێزەی خۆی بەشێکە لەئاراستەکراو ئاراستەکراوەکانی دیش بخاتە بابێکی خراپەوە، ئەگەر حزب بیتوانیبایە وەزیفەی خۆی ببینێت و نەبێتە پەیژەیەك بۆتاقە خێڵێك هەڵبەتە ئەوکات خێڵەکانی دیش دەبونە بەشێك لەو جولاًنەوەیە نەك بەشێك لە دژی. بارزانی و حزبەکەی لەژێر گوتاری خەباتدا هەنگاویان ناوەو خێڵەکانی دیشیان بە خیانەت کەر ناو بردوە، بەس ئەوەی خێڵەکانی دی ناچار دەکات پشت لە ئەیلول بکەن خودی بارزانی بوە، لەکاتێکدا خۆی لەژێر سێبەری دەسەلاًتەکانی دیدا هەنگاوی ناوە، لای ئەو تەنها ئەو دەوڵەتانە دوژمنی کورد بوون کە شەریان لەگەڵ ئەودا کردوە، بۆیە هەرکەسێك چوبێتە پشت ئەو دەوڵەتانە وشەی خیانەتی خراوەتە پاڵ بەبێ ئەوەی بنەرەتی ئەو چونە بزانرێت لەسەر چ بنەمایەك بوە، ئیدی ئەو دەوڵەتانەی هاوکاری جولاًنەوەکەی ئەویان کردوە بەدەوڵەتی باش تەماشاکراون بەلاًم هەرخۆی

سەردەمانێك ئەودەوڵەتانە پشتیان تێکردوە ئەوانیشی بەخیانەتکار تەفسیرکردوەو خەڵکیش باوەری بەم جۆرە گوتارە دوفاقیە هەبوە.

کوشتنی خێڵەکانی دی یەکك بوو لەهەنگاوەکانی ئەیلول، بەشێکی زۆری ئەو سەرۆك خێڵانەی دەسەلاتەکەی بارزانیان قبولْ نەبوو یان دەستگیردەکران و لەناو دەبران یان خۆیان داوەتە پالْ دەوڵەتەکانی دی، رێگەی سێهەم نەبوە، بۆیە زیندانی رایان زۆربەی ئەو پیاوماقولْ و سەرۆك خێلانەی تێدا زیندانی بوون کە بارزانی بەمەترسی زانیون بۆ ئایندەی خێڵەکەی خۆی، دەستگیرکردنی ئەوانە لەسەر بنەمای ئەوە نەبوە دژی شۆرشن بەڵکو لەسەر بنەمای ئەوە بوە لای بارزانی قبولْ نەبوون، کوشتنی " فاخیر مێرگەسوری و "٣٢" کەس لەبنەماڵەکەی(٣٤)". کوشتنی ئەو ئیرادەیە بوە کە لەناوچەی بارزان دروست بوە، جگەلەوە بنەماڵی مێرگە سووری خالۆیانی بارزانیەکانن، بەس کاتێك دەبنە مەترسی لەناوچەی بارزان و هەواداری زۆریان بۆ پەیدا دەبێت ئیدی بارزانی لەرێگەی حزبەکەیەوە دەستگیریان دەکات و پاش ئەشکەنجەدانێکی زۆریان گولە بارانیان دەکات بۆئەوەی لەو ناوچەیەی قەڵەم رەوی

خێڵەکەیان هیچ دەنگێکی بەرز دروست نەبێت، حزب لەم کاتانەدا بەبێدەنگ دادەنیشێت و لەناو بردنی بنەماڵەیەك بەکارێکی ئاسایی دەزانیٚ کە بارزانی و نەوەکانی پێی هەڵساون. فاخیر مێرگە سوری و بنەماڵەکەی یەکێکن لە بنەماڵە خەبات گێرەکان و هەمیشە ئەم پیاوە باوەڕی بەوە هەبوە لەدەرەوەی دیدی خێڵ خەبات بکات و یەکەمین کەسە لەو ناوچەیە دور لەبارزانی لەگەڵ حزبی شویعی کاری کردوە، هەرئەم پێگە بەهێزەی دەیکاتە کەسێکی دیار لەسەردەمی ئەیلولدا و ئەم ناوەی دەبێتە هۆی مەترسی بۆی و لەکۆتایەکاندا بارزانی و کوڕەکانی گولەبارانی دەکەن بۆئەوەی نەفەسێکی دی لەوناوچەیە دروست نەبێت و ڕێگە لە دەسەلاتی ئایندەی نەوەکانی بارزانی نەگرێت.

ئەیلول نەك هەر ئەوانەی کوشتن کە لەدەرەوە حزب بوون، بەڵکو کوشتنی ئەوکەسانەی لەناو حزبن و گومانێکی خراپیان لەسەرە یەکێك بوو لە ستراتیژەکانی ئەو حزبە، هەر لەو سەردەمەدا " عەلی حەمدی" کە ئەندامی سەرکردایەتی پارتی بوو، بەدەست هێزەکانی ئەیلولەوە کوژرا(٣٥) کوژرانی ئەم بەرپرسەی پارتی پەیوەندی بەنیگەرانیەکانی بارزانیەوە هەبووە لەم کەسە، لەناو

کۆی پێکهاتەی حزبیش مێژووی ئەم جۆرە کوشتنانە شاراونەتەوەو بەتەواوەتی رودانی کوشتنەکان بۆ خەڵك رون نەبوەتەوە، تەنها گومانێك و تۆمەتێك بەس بوە بۆئەوەی کەسی کوژراو ببێتە کارەکتەرێکی ناشیرین لەناو هێزێکی نەخوێندەوار و مێژووی خەباتی ئەو کەسە بسرێتەوە بۆئەوەی خاڵێکی رەش نەکەوێتە سەر ئەیلول، کوژرانی ئەحمەد عەبدوڵا ئەندامی سەرکردایەتی پارتی بەدەستی پارتی(٣٦) ئەم کەسە بەرپرسێکی پارتی بوە لە سنووری دهۆك و ماوەیەکیش لەیەکێتی قوتابیانی پارتی کاری کردوە، یەکێکە لەدامەزرێنەرانی ئەو رێکخراوە حزبیەو پارتی پاش ئەوەی کاری بەم کەسە نامێنێت لەسەر فەرمانی سەرکردایەتی دەیکوژن، لەو ساڵانەدا کوشتن و پاکتاوکردنی ئەندامان و سەرکردەکانی حزب لەلایەن دەستەی مەکتەبی سیاسی و دەستەی بارزانی کە بە مەلایی و جەلالی باسیان دەکرێت دەستی پێکردبوو، کوشتنی خەلیل شاوێس لەچەمچەماڵ بەدەستی حزب(٣٧) . دەیان نمونەی کوشتن و پاکتاوکردن لەبەردەستدان، کە لەلایەن حزب و خودی بارزانی و نەوەکانیەوە ئەنجام دراون، جاری واهەبوە بەکۆمەڵ کوشتن دەستی پێکردوە، نمونەی ئەو کۆمەڵکوژیەی چەرمەگایەکان و گۆمەشینیەکان دوو نمونەن تەنها مەیلی

بارزانیە بۆ ترساندنی ناوچەکانی دی و پیشاندانی دەسەلاتی خێڵە لەو سەردەمەدا.

دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت پاش ئەوەی ساواك لەرێگەی خۆیەوە نوێنەرێکی دەزگای سیخوری ئیسرائیلی هێنایە ناوچەکانی چۆمان، لەساڵی ١٩٦٨ دەزگای سیخوری پاراستن دامەزرا(٣٨). ئەم دەزگایە پێش ئەوەی دامەزرێت بارزانی کورەکەی خۆی مەسعود بارزانی نارده ئیسرائیل و خولێکی سیخوری کردنی بینی بۆ بەرێوەبردنی ئەم دەزگایە(٣٩). دروست بونی ئەم دەزگایە تەنها ئەرکی پاراستنی بنەماڵەو خودی بارزانی بوو، لەگەڵ دەست بەکار بوونی ئەم دەزگایە هەموو نەیارەکانی بارزانی لەناو حزب و لەدەرەوەی حزب کەوتنە بەر شالاوی کوشتن و راوەدوونان، قەت روینەداوە لەو چەند ساڵەی ئەیلول ئەم دەزگایە کار لەسەر دەزگا سیخوریەکانی دەوڵەتانی دراوسێ بکات و بەشوێن ئەوانەدا بگەرێت کە مەترسین بۆسەر کورد و ئەیلول، بەڵکو هەمیشە بەشوێن نەیارەکانی بنەماڵەدا دەگەراو ستراتیژی دەزگاکە بویە سرینەوەی نەیارانی بارزانی و بنەماڵەکەو و تا ئەم سالانەی دوای یەکەمین هەنگاوی ئەم دەزگایە تەنها ئەو هەنگاوانەیە کە

لەسەرتای ئەيلولەوە كاری لەسەر دەكات، زۆر كەم رويداوە پاراستن دەست بۆ ئەفسەرێك يان كەسێكی سيخوری ناو عێراق و ئێران و توركيا ببات، بەڵكو هەميشە دەستی بۆئەوانە بردوە كە لەناو حزب و لەدەوروبەری حزب كەمێك مەترسی دروست دەكەن و لەسەر جياوازی بيركردنەوە بونەتە قوربانی. ئيسرائيليەكان لەرێگەی ساواكی ئێرانەوە هاتونەتە ناوچەی چۆمان و لەسەرداوای شا ئەو پەيوەنديەيان دروست كردوە، مەسعود بارزانيش هەر لەرێگەی ساواكەوە چوەتە ئيسرائيل و ساواكيش رێگەی خۆشكردوە بەخاكی ئێراندا لەگەڵ وەفدێكی تايبەتدا سەردانی ئيسرائيل بكات و داوای پشتگيری كردنيان لێبكات، دامەزراندنی دەزگای پاراستنی پارتيش نەخشەی ئيسرائيليەكان بوە، بۆئەوەی زانياری ئاڵوگربكەن، بەڵام بارزانی زوو دەستيگرت بەسەر ئەم دەزگايەدا و كۆنترۆڵيكرد و خستيە خزمەتی پاراستنی خۆی و بنەماڵەكەی و تائەم كاتانەش وەزيفەی ئەو دەزگايە هەمان ئەو ديدەيە كەبارزانی هەيبوو بۆ ئەو دەزگايە.

لەگەڵ دەركەوتنی جەلالی و مەلايی ئيدی پاكتاوی يەكتری كردن لەلايەن هەردوو لاوە سەری هەڵدا، ساڵی ١٩٦٨ كوژرانی

"ئەحمەد رەشوانی" لەلایەن پارتیەوە بەبیانوی ئەوەی سەر بە جەلالیەکانە(٤٠). کوژرانی " قادر شەریف" بەدەستی یوسفە لچەو چەن پێشمەرگەیەکی پارتی لەشاری سلێمانی(٤١). فرێدانی نارنجۆکێك بۆماڵی کەریم حەداد لە قەڵادزێ کە شوێنی پێشمەرگەکامی حزبی دیموکرات بوو بەدەستی پارتی(٤٢). گرتن و دەست بەسەرکردنی ئەندامانی حزبی دیموکرات کە شەریان لەگەڵ ئێران راگەیاند بوو(٤٣). کوشتنی کەمالی ئەحەرشو ۆ باوکی و بێسەرو شوێنکردنیان لەلایەن بەرپرسانی ئەیلولەوە(٤٤). کوشتنی چەندین کەس لەخێڵی چەرمەگایەکان بەدەستی بارزانی (٤٥). کوشتنی کۆمەڵێك کەس لە سنووری ناوچەی هەڵەبجە بەدەستی عەبدولوەهاب ئەترۆشی (٤٦). دروستکردنی هێزی کوتەك بۆ سەرکوتکردنی نەیارانی پارتی(٤٧). راوەدونانی هەوادارانی ئیبراهیم ئەحمەدو نوری شاوەیس و هاورێکانیان و دەستگیرکردنی هەندێکیان و ئازاردانیان(٤٨) . ئەم کۆمەڵە نمونەیە بەشێکن لەو جەنگەڵەی لەسەردەمی ئیلولدا رویان داوە، لەم نمونانەدا ئەوە بەدیدەکرێت کە دامەزراندنی ئەیلول و دەستگرتنی بارزانی بەسەر جولاْنەوەکەدا بۆئەوە نەبوە کارەکتەری کوردی ئازاد بێت یاخود هەوڵی بەدەست هێنانی ئازادیەکانی خۆی و بۆچونەکانی خۆی

بدات، بەڵکو هەوڵێك بوە بۆ بەدەست خستنی کۆی گشتی خەڵك بۆ ژێر یەك دەسەلأت و یەك ڕەنگ، ئەویش ئەو دەسەلأتەی لەرێگەی هێزە سەربازیەکانیەوە حکومی خۆی بکات و مامەڵەکانی خۆی لەگەڵ ناوەوەو دەرەوە بکات. جیابونەوەکانی باڵی مەکتەب سیاسیش هەر لەسەر ئەو بنەمایە دروست دەبێت کە دەسەلأتی تاکرەوی لەناو حزبدا کۆتایی بێت، پیشاندانی چەن نمونەیەك تەنها وەك دەرگایەك تەماشامان کردوە بۆئەوەی قسە لەسەر ئەو ستەمە بکەین ئەیلول لەبری ئازادی هێناویەتە ئاراوە، دەمانەوێت بڵێین ئەوە وەهمە پێمان وابێت ئەو سەرهەڵدانە شۆرشەو دەرگایەك بوە بۆبەدەست هێنانی ئازادی، لێکترازانەکانیش رونی دەکەنەوە بۆمان ئەیلول ئەو خەونە نەبوە کارەکتەری کوردی خۆی تیا ببینێت، وەختێك کە باڵی مەکتەبی سیاسی سەرقاڵی پرۆژەی کۆنفرانسی خۆیان دەبن و دەیانەوێت مۆدێلێکی دی حزبی دروست بکەن بارزانی و هێزەکانی هەڵدەکوتنە سەریان بۆئەوەی بیان سرنەوە، بارزانی نەیتوانیوە هەرگیز کەسێك قبۆل بکات پێچەوانەی بۆچونەکانی ئەوەوە کار بکات، چونی ئەو باڵەش بۆ ئێران خۆرزگار کردن بوە لەکوشتن و پەلاماردان، هەرچەندە هەڵەکەی ئەوان ئەوەبوو لەسەرتادا حزب دەدەنە دەست خێڵەکان و کەسە نەخوێنەوارەکان، بەلأم ئەوە

هەڵەی سیاسی نیە تیمێك حزبێك قبولْ نەکەن و بێنە دەرەوەو بەسەرۆکی حزبەکەیان بڵێن ئیدی بەشێك نین لە حزبەکەی تۆ، خۆ ئەگەر ئەو تیمە هەڵەیان هەبێت حزبی دیموکرات ئەو هەڵەیەشی نەبوو لەلایەن هێزەکانی بارزانیەوە سەرکوت دەکران و ئەندامەکانیان دەکوژران، بارزانی ڕێگەی بەخۆی داوە پارە لەشاو لە روسەکان وەربگرێت بەلاّم ڕێگەی بە باڵی مەکتەبی سیاسی نەداوە خەباتی خۆیان لەناو کوردستان بکەن و ڕێگەی بەحزبی دیموکرات نەداوە شەر لەگەڵ ئێران بکەن، چونی ئیبراهیم ئەحمەد و جەلالیەکان بۆ هەمەدان دەبێتە خیانەت، بەس چونی بارزانی بۆ تاران ولای شا نابێتە خیانەت!. هەمیشە کەنوێنەرەکەی شاو ساواك هاتون بۆلای بارزانی بەڵێنی ئەوەی پێداون بەبێ ئاگاداری ئەوان هیچ کارێك ئەنجام نادات و خەباتە نوێیەکەشی بە پشتی ئەوان ئەنجام دەدات، هەرچەندە بیرورای شاو ساواك لەسەر بارزانی جیا بوەو، ساواك پێی وابوە دەبێت هاوکاری باڵی مەکتەبی سیاسی بکەن و شا بەمە رازی نەبەوە، بەلاّم لەکۆتایدا شا هەردوولا دەخاتە ژێر رەحمەتی ڕێکەوتنێکی خۆی و کۆتایی بە گەمەکە دەهێنێت.

دەبێ بپرسین بۆچی بارزانی شویعیەکانی ئاشت کردەوە ڕێگەی پێدان لەناوچەی چۆمان دەست بەخەباتی خۆیان بکەن بەس ڕێگەی بەمەکتەب سیاسی حزبەی کەی نەدا ئەوخەباتە سیاسیەی خۆیان لەسنووری سلێمانی بکەن؟ ئەی پاش کۆنگرەی ماوەتی باڵی مەکتەب سیاسی بۆچی بارزانی کۆنگرەی حزبەکەی خۆی بەست و خۆی بەسەرۆکی حزب هەڵبژاردەوە لەکاتێکدا دژی حزب بوو؟ ئەی چۆن لەکۆنگرەی کۆیەو رانیەدا کورەکانی خۆی کردە سەرکردایەتی؟ بۆمەسعود بارزانی کردە بەرپرسی دەزگای پاراستن؟ ئەی پاشان بۆچی حزبی دایە دەست بنەماڵەکەی گەر حزب شتێکی بێزارو بوو لای ئەو؟ کاتێك داوای لە کیسنجەر کرد "٣٥٠" ملیۆن دۆلاری بداتێ بۆئەوەی دژ بە عێراق بجەنگێت و هێزی روسیا کەم بکاتەوە ئەی بۆچی خۆی لە ڕێگەی قونسوڵی روسیاوە پارەی وەردەگرت؟ کوشتنی پارتیەکان و غەیرە پارتیەکان و راوەدونانی خێڵەکان ئەرکی شۆرش بوو یان ئەرکێکی خێڵەکی بوو؟ دەستگیرکردنی کوێخاو پیاو ماقوڵانی ناوچەکان ئیشی شۆرشە یان ئیشی ئەو هێزەیە ستەمکار بەرهەم دەهێنیت. گەر ئەیلول نەبوایەو لەبری پرچەکردنی کۆمەڵگەیەك خەباتی شار دەستی پێکردایەو لەرێگەی مەدەنی و سیاسیەوە کارەکان ئەنجام بدرانایە ئەنفال

رویدەدا؟ گوندەکان وێران دەکران؟ هەڵەبجە سەری هەڵدەدا؟ هەموو ئەم پرسیارانە دێنە بەردەم ئێمەو وەڵامی هەریەك لەو پرسیارانەش شەرمەزاریەك دەخاتە بەردەم ئەو سەردەمە، گەران بەناو کوچەکانی ئەیلولدا توشی دەیان شەرمەزاری و سەرسوڕمانمان دەکات، پێمان دەڵێت بناغەی هەر سەرهەڵدانێك بەم شێوەیە بێت ئایندەکەشی هەر ئەو دۆخە خراپە دروست دەکات کە نەوەکانی پاش ئەو سەردەمە تێیدەکەون، بۆیە هەمیشە دەبێ بپرسین بەخوێندنەوەی ئەو کارەساتانە چی لە ئێستەمان دەکات؟ ئایا لەیادەوەریمان بیان سرینەوە یاخود پیشانیان بدەین بۆئەوەی بەشەرمەوە تەماشای پێش خۆمان بکەین؟و رێگەنەدەین ئایندەشمان وابێت.

ئەمانەو دەیان پرسیاری دی دێنە بەردەم نەوەی نوێمان بۆئەوەی دیوە تاریکەکەی مێژووی کورد بناسێت، کاتێك بارزانی خێڵی گواستەوە بۆناو کایەی سیاسی ئیدی کۆڵەکەکانی حزب کۆتایان هات و حزب بویە گۆچانێك بەدەست خێڵەوە، بارزانیش کەدەسەڵاتی وەرگرت تێگەیشت دەبێت ئەم دەسەڵاتە وەك خۆی بمێنێتەوەو بگوازرێتەوە بۆ نەوەکانی خۆی، کەشکستیشی هێنا شکستەکەی بەسەر میلەتێکدا ساخ کردەوە نەك تەنها هێزێك و

زۆر بەسادەیی دوای شکستەکەی لەرۆژنامەکانی ئێراندا ڕایگەیاند " کاری ئەو تەواو بوە" واتە مەئموریەتێکی هەبوە مەئموریەتەکەی بەکۆتا هاتوەو دەبێت ئیدی کەسێکی دی ئەوکارە بکات، لەم حاڵەتانەدا رون دەبێتەوە بۆمان ئەو مێژووەی کە حزب دەینوسێتەوە ئەو دەرگا روناکە نیە ئەوان باسی لێوە دەکەن بەڵکو ماهیەتی مێژووەکە بۆگەنی کردوە بە ململانێی بچوکی حزبی و خێڵەکی. مەسعود بارزانی لەکتێبەکەی نکۆڵی لەوەدەکات ئێران پارەی بەوان دابێت، بەڵام نکۆڵی لەوەناکات کە بارزانی شای بینیوە و پشتیگری کراوە لەلایەن شاوە، پشتگیری کردنی شا بۆ بارزانی گەیشتە ئەو ئاستەی داوا لەئەمریکایی و ئیسرائیلیەکان بکات هاوکاری ئەو جوڵانەوەیە بکەن بۆ دروستکردنی پشێویی لە عێراق، ئەمە بەخیانەت تەماشا ناکرێت لای پارتی، وەلێ ئەوە بەخیانەت تەماشادەکرێت کاتێك هەڵدەکوتنە سەر باڵی مەکتەبی سیاسی و راویان دەنێن بۆ هەمەدان، چونی ئەوان بۆهەمەدان خیانەتە بەس چونی بارزانی بۆلای شاو پشتگیریکردنی شۆرشگێریە لە ئەدەبیاتی حزبی. کێشەی ئەم دوو دیدە ئەوەیە ئەیلول ئەو فەزایەی خولقاند لەدەرەوە پارتی لەدەرەوەی خەباتەو هاتنە ناوپارتی هاتنە بۆناو شۆرشگێری، لەکاتێکدا ئەوەی ئەیلول دەرهەق بە تیرۆرکردنی

کارەکتەری کوردی کردی هەمان ئەو حاڵەتەبوو هێزەکانی پاش ئەو لە عێراق و ناوچەکە دەرحەق بەکورد کردیان. ناکرێت بەرگری لەخیانەت بکرێت، چ باڵی مەلایەکان و چ باڵی تاڵەبانی کردبێتیان، چونکە هەردولا بیٚ بەش نەبوون لە خیانەتکردن و دروستکردنی کارەساتی گەورە بەسەر کوردا، هەردوولا خیانەتیان کردوە بەڵام بەشێوەو قەبارەی و زەمەنی جیاوە، هیچ کام لەم دوو تاقمە بەپاکی نەهاتونەتە دەرەوەو بەرپرسیاری یەکەمن لەهەموو خیانەت و شکستەکان و هەڵەکان.

ئەیلول نەك هەرنەیتوانی کارەکتەری بیرکەرەوە دروست بکات و هێزی ئیرادەی تاکی کورد بخاتە دۆخێك خۆ تەحقیق بکات، بەڵکو بویە خەنجەرێك بۆ کوشتنی ئەو دوو دۆخەو هەموو ئەوزیندویەتیەی بە چەند ساڵێك وێرانکرد لەناو ئیرادەی تاکەکاندا سەری هەڵدابوو، عەقلیشی خستە پەراوێزەوە لەبری ئەوەی وەلائی خێڵەکی و وەلائی حزبی خستە شوێنی، جیاوازیەکانی هێندەکاڵکردەوە پارتیەك لە بارزان و پارتیەك لەخانەقین وەك یەك بیر بکەنەوەو وەك یەك تەماشای دەرەوەی خۆیان و ژیان بکەن، بەیەك رەنگکردنی ئەم فەزایە ئەم دۆخە ناتەندروستانەی دروست کرد کە ئێستە نەوەیەك سەرقاڵی

سرینەوەیانە، راستە ئەو سەردەمە کرایە سەردەمی بەرگریکردن بەڵام بەرگریکردنیش خرایە خزمەتی تاقمێك ئەو ئەو تاقمە حزبیان کردە دیوارێك بۆ بەرژەوەندی و پاراستنی ژیانی خۆیان و خانەوادەکانیان، هەموو ئەو هێزانەی لەناوچەکەدا هەبوون بونە تەرەفگیری یەکێك لەو بەرانەی کەلەناو حزبدا ناکۆکیان هەڵگرتبوو، هاتنە دەرەوەی ناکۆکیەکانی حزب لەماڵی حزبەوە بۆناو کۆمەڵگە ئیدی بەتەواوەتی فەزاکەی گۆڕی و کردیە شەرێکی خوێناوی لەپێناو گرتنە دەستی کورسی حزب، هەر یەك لەو بەرانە ئەویدی بە کەسی خراپەکار و ناکامڵ تەفسیردەکردو مانای دەدا بەو شەرەی هەڵگیرساوە، بەرەیەکیان لەناو کوردستان مایەوە بەرەیەکیان چوەناو عێراق و بەهاوکاری عێراق شەری بەرەکەی دی دەکرد، شەرەکە لەوە دەرچوە وەك شەری دووبەرە تەماشا بکرێت، بەڵکو بویە شەری دەوڵەتە دراوسێکانی " ئێران و عێراق" لەو نێوانەشدا ئەمریکا بۆئەوەی بالانسی سۆڤیەت لاواز بکات بە پێی زەمەنەکان مامەڵەی لەگەڵ هەریەك لەو دوو بەرەیە دەکرد، کەناوچەکە بوەتە شێونی شەرکردن، بۆ وڵاتانی دراوسێ ئاسانبوە دەست بخەنە ناو گۆمەکەوە، پێش شەرەکە نەیان توانیوە وەك سەردەمی شەری ئەو دوو تاقمە گورز لە کورد بوەشێنن، بەڵام ئەو دوو تاقمە

کارێکیان کردوە باشترین گورز بەر کورد بکەوێت، هەرکامێکیشیان لاواز بوە پاڵی بە یەکێك لە دەوڵەتە نەیارەکانی کوردەوە داوە، وەختێکیش بەعسیە نەتەوەیەکان هاتنە سەردەسەلاَت فشارەکان زۆر تربوون و شەرەکان لەشەری حزبەوە بوون بەشەری کورد و دەوەڵەت، لەناو خۆی حزبیشدا میلیشیاکان لەسنووری قەڵەم رەوی خۆیان بەیاسای جەنگەوە مامەڵەیان لەگەڵ هەموو ئەو هاولاَتیانە کردوە کە لەژێر حوکمی ئەواندا بوون، بارزانیش بە پاڵپشتی ئێران و ئیسرائیلیەکان کۆمەڵێك هەنگاوی توندی ناوە دژی بەرەکەی تر و شەری یەکلایەنەشی دەستپێکردوەتەوە دژ بە دەوڵەتی عێراق، کارەکە لەوە دەرچووە ئەو دوو هێزە بتوانن ئاراستەکان رابگرن.

کوشتنی ئینسانی کورد لەسەردەمی قاسمدا لەشۆرشی ئەیلولەوە دەست پێدەکات، زیندوکردنەوەی ئیرادەی ئینسانی کوردیش لە خێڵەکانەوە سەر هەڵدەدات، بێ بەرنامەیی لەم شۆرشە لەیەکەم چرکەساتیەوە دەردەکەوێت کە حزب دینەمۆی سەرهەڵدانەکە نەبوە بەڵکو خێڵەکان دینەمۆبوون، کەخێڵیش بویە دینۆمۆ ئەوا ئەو سەرهەڵدانە ناوی نانرێت شۆرش و زیندوکردنەوەی ئیرادەی نەتەوەیی، بەڵکو داخوازیەکانی خێڵ

داخوازی بچکو بوون لەسەر زەویەکانیان، نەك خەونی بەدەست هێنانی نەتەوەو دەوڵەت، ئەیلولیش کەوتوەتە ئەو دۆخەوەی خێڵەکان دروستیانکردوە، ئیدی کە یاخی بوونەکە پەرەدەستێنێت حزب دێت خۆی دەکات بەخاوەنی و دەیەوێت ئاراستەی داخوازیەکان بگوازێتەوە بۆنەتەوە، لەودۆخەدا ئێرانیەکان و روسەکان هاوکاری حزبیان نەکردایە حزبیش نەدەکەوتە ئەودۆخەو حکومەتی عێراق داخوازی خێڵەکانی جێبەجێدەکرد و کۆتایی بە نارەزایەتیەکە دەهات، بەس چونکە بۆ دەوڵەتانی دراوسێ گرنگ بوو دۆخی عێراق تێکدەن بە هاوکاریەکانیان یاخی بونەکەیان گەورەکرد و حزبیشیان خستەناوی، حزبیش نەیتوانی ببێتە قوتابخانەیەك بۆ پەروەردەکردنی نەوەیەکی خوێنەوار چ لەروی سیاسی چ لەروی ئابووری چ لەروی سەربازی، بەڵکو بانگەوازەکەی بۆ ئەوەبوو میلەتێك پرچەکبکات و بیخاتە دۆخی شەرەوە، لەوەختێکدا ئەو دۆخە دۆخێکی ناتەندروست بوو، بۆیە کاتێك هێزە چەکدارەکان لەشوێنێکدا شکستیان دەهێنا کاریگەری خراپی هەبوو لەسەر کۆی سایکۆلۆژیەتی کۆمەڵگە، یانی نەتوانرا شتەکان لەیەکتر جیات بکەنەوە و ئیرادەی میلەتێك کەوتە سەر حوکمی لولەی تفەنگەکانی ئەو هێزانەی کە بەشێوەیەکی میلیشایی مامەڵەیان

لەگەڵ شەرەکاندا دەکرد، ئەم هێزە میلیشاحزبییەی کە ئێستە بوەتە کێشەیەکی گەورەی هەرێم رەچەڵەکی دەچێتەوە سەر ئەو تورەبوونانەی ئەیلول. ئەوانەی سەرکردایەتی جولانەوەکەیان کردوە بەرژەوەندی نەتەوەیەکیان بەستوەتەوە بە بەرژەوەندی هێزە چەکدارەکانیانەوە، نامەکانی بارزانی بۆ کەسایەتیە سیاسەکانی دەرەوە و لاوازیەکانی لەنامەکاندا بۆمان دەرخات ئیرادەی سەرکردایەتی ئەو جولانەوەیە زۆر لاواز بوەو تەنها لەناوخۆی کوردستاندا دژی یەك ئیرادەیان بەهێز بوە ئەگینا لەبەردەم بێگانەکاندا زۆر بەلاوازی خۆیان پیشانداوە.

رەنگە بۆپارتیەکان ئەیلول قوتابخانەیەك بوبێت و هەمیشە بەم ناوە باسی بکەن، بەس بۆ کەسێك کە خوێندنەوە بۆئەم قوتابخانەیە بکات تێدەگات خراپترین قوتابخانە کە ئینسانی کوردی لەم سەردەمەدا لەسەر بنیات نرا ئەیلول بوو، هەموو بەرەکان لەم سەردەما جیابوونەوە، باش و خراپ لەم سەردەمەدا ناوی لێنرا، لێکترازان و بەخیانەتکردنی سەردەمی نوێ لە ئەیلولەوە دەستی پێکرد، بەمیلیشیاکردنی نەوەیەك لەم سەردەمە دەستی پێکرد، زیندانی کردن و کوشتنی کۆمەڵ لەسەر جیاوازی هەر لەم سەردەمەدا دەستی پێکرد. پێش ئەوەی

بەعس بێت و زیندانەکانی ببنە شوێنی ئەشکەنجەی تاکی کورد ئەیلول ئەو کارەی کردوەو بەخرابترین شێوە مامەڵەی لەگەڵ ئەوکوردانە کردوە لە دەرەوەی بازنەی ئەیلول بوون، گەر لەدەرەوەی ئەم فەوزایە زەمینەیەکی تەندروست دروست بکرایە بۆ کارەکتەری کوردی دۆخەکە بەم شێوەیە درێژەی نەدەکێشا بۆئێستا، ناکرێت تۆ وەك هێزێك بچیتە خانەی بەرگریکردن و هەموو ئەو هێزانە بەخراپ باسبکەیت کە لەگەڵ هەنگاوەکانتدا نایەن، سەرکردایەتی حزب کە سەرکردایەتیەکی گوێرایەڵ بوەو نەیتوانیوە بەرگری لەخۆی و بۆچونەکانی بکات چوەتە ناو هەمان دۆخی خێڵەکانەوە، گەورەترین دەستکەوتی ئەیلول ئەوەیە بەیانی ١١ ئازاری ئیمزاکرد لەگەڵ حکومەتی عێراقدا، لەکاتێکدا ئەو داوایانەی لەبەیانی ١١ ئازاردا بوونی هەیە پێشوتر لەسەردەمی قاسمدا بوونیان هەبوو، دروستکردنی ئەو شەرەماڵێورانەی لەگەڵ قاسمداکراوە شەرێکی نەزانانەو مەئموریەتیانە بووە، دەستکەوت ئەوەنیە هێزی نەیارەکەت ناچار بکەیت ددان بە بوونی تۆدا بنێت، دەسکەوت ئەوەیە کە شۆرشتکرد بەمانا راستەقینەکەی دەبێت میلەتێك هوشیار بکەیت و پرچەکی بکەیت بە زانست بۆئەوەی لەناو دۆخی شارەکاندا خەباتی سیاسی خۆی بکات و هێزێکیش لەپشیتەوە

بەرگری لەو دۆخ و خەباتە سیاسیە بکات، ئەیلول هیچ دەرتانێکی بۆئەم جۆرە هەنگاوانە نەهێشتوەتەوە هەموو کۆمەڵگەی خستوەتە یەك دۆخەوە ئەویش چەك هەڵگرتن و کوشتن چ لەناو خۆ چ لەدەرەوەی حزب. گەر حزبی ئێستە شانازی بەم جۆرە قوتاپخانانەوە بکەن دەبێ بەدبەختی ئایندە لەبەردەم ئەم شانازی کردنەدا ببینین، پشتکردن لەم جۆرە سەردەمانەو دووبارە نەکردنەوەی هەنگاوەکانی باشترین و چاکترین چارەسەرە بۆ نەوەی پاش ئێمە، گەروانەکەین هەر شکستێکی حزب دەبێتەوە بەشکستی نەتەوەیەك.

وەك دەبینین کاتێك هێزە چەکدارەکان ئەیلول توشی شکست دەبن میلەتێك دەچێتە هەمان دۆخی شکستەوە و شکستی حزبێك دەبێتە شکستی میلەتێك، مانایەك بەو شکستە دەدرێت بەبێ ئەوەی تاقمێك لەو هێزانە بیر لەوەبکەنەوە بەرگریکردنەکە دەست پێبکەنەوەو ئومێدێك بخەنە ناو خەیاڵی کەسی کوردەوە، راستیەکەی ئاش بەتاڵی ١٩٧٥ ئاشبەتاڵی کورد نیە لەخەباتی نەتەوەیی خۆی، بەڵکو ئاش بەتاڵێ حزبێکە لە هەڵە سیاسی و سەربازیەکانی، راکشانی میلەتێکە بۆبەردەم هێزێکی دڕندە، کە ئەوحزبە لەسەردەمی کۆدیتاکەیاندا پشتگیری کردن و بێدەنگی

هەڵبژارد تاکو بێتە سەردەسەلات، گەر لەسەردەمی کۆدیتای بەعسیەکاندا ئەیلول و بارزانی بێدەنگیان هەڵنەبژاردایەو یەك لایەنە شەریان رانەگرتایە، دەکرا لەرێگەی ئەو تەکنیکی شەرەوە دەسەلاتی ئەیلول بگوازرێتەوە بۆشارە گەورەکانی کوردستان، بەلاّم ئەیلول و بارزانی ئەمەیان نەکرد تاکو ئەو هێزە تازەیە هاتە سەر کورسی دەسەلاّتی عێراق خۆی گرت و کەوتە پەلاماردانی ناوچە کوردیەکان، ئەمەش بویە دەرگایەکی دی کە کەسی کورد جارێکی دی کەوتەوە بەر هێرشی ناوخۆی و دەرەوە، ئەونامەیەی ئەیلول بە ئێمەی دەدات نامەی تێکشکانی کارەکتەری کوردیە، مێژوویەکە ئینسانی کوردی لەسەر خراپترین دۆخ تێپەراندو گەیاندیە ئەو پەری نائومێدی.و رەگوریشەکانی خێلّ گوازرانەوە بۆناو پایە سیاسیەکان و کۆتایی بەعەقلّی تاك هات و عەقلّی خێلّەکی و گروپ گەرایی خۆی دەرخست. لە ئێستەدا تاقە شانازیمان ئەوەیە هەلّەکان و خیانەتەکانی ئەیلول دەرخەین و هەولّدەین دووبارە نەبنەوە، هەولّدەین ئینسانی کوردی چیتر لەسەر بنەمای عەقلّی خێلّ و حزب کەرامەتی نەروشێت، پاشان ئازادی لەفۆرمی دروشمەوە بگۆرین بۆ بنەما راستەقینەکەی خۆی، نەگەرانەوە بۆئەو سەردەمەو دووبارە نەکردنەوەی ئەو پەروەردەیە سەرکەوتنە بۆ

ئێستە، گەر بەشێکی ئەو سەردەمە جێگەی شانازی بێت بەشەگەورەکەی جێگەی شەرمە. بۆزیاتر رێگەگرتن لەشەرمی گەورەتر دەست بخەینە سەرخاڵەکان و نەهێڵین خاڵی رەشی دی روبداتەوە. نەك بێدەنگی بکەینە چەکمان و دووبارە کارەساتەکان بێنەوە رێگەمان.

# لێکترازان و یەکتر سرینەوە

لە "٨_٢_١٩٦٣" لەگەڵ کۆدیتای بەعسیەکان لە عێراق و روخانی حکومەتەکەی قاسم بارزانی لای خۆیەوە بەبێ گەڕانەوە بۆمەکتەبی سیاسی حزب ئاگر بەستی راگەیاند(٤٩) ئەم ئاگر بەستە یەك لایەنەیی بارزانی بویە بیانوێك بەدەست باڵی مەکتەبی سیاسی پارتیەوە، هەرچەندە پێشوتر ئەم باڵە کە ئیبراهیم ئەحمەد و تاڵەبانی و نوری شاوەیس تێیدا بالأدەست بوون نیگەران بوو بوون لە هەڵسوکەوتەکانی بارزانی و خێڵەکەی لەناو حزب و پێیان باش بوو حزب و مەکتەبی سیاسیی حزب خاوەن بریاری سیاسی بێت و خێڵ و بارزانی بۆیان نەبێت بەو شێوەیە دەست بەسەر حزبدا بگرن، بۆیە لەناو حزب و لەناوچەکانی تری ژێردەسەلأتی حزب کەوتبونە خۆ و هەوڵی ئەوەیان دەدا نیگەرانیەکانی خۆیان دەرهەق بە بارزانی بگەیەنە لای خەڵك و ئەندامانی حزب لەو تاکرەویەی بارزانی ئاگاداربکەنەوە، بەرەیەکی باشیان بۆخۆیان پێکهێنابوو، بارزانیش بەبێ حسابکردن بۆئەوان بەردەوام پەیوندی بە دەوڵەتانی دەرەوە کردوەو کاری سیاسی ناوخۆشی خستوەتە ژێر رکێفی فەرمان رەوایی خۆی، لەگەڵ دەرکردنی ئەم بەیانی

ئاگر بەستە ئیدی ناکۆکیەکانی مەکتەبی سیاسی زیادی کردو ئەمەیان بەهەنگاوێکی باش زانیوە بۆ جیابوونەوە و لێدان لەدەسەڵاتەکانی بارزانی، پێیان وابوە ئەم هەنگاوەی بارزانی کارێکی ناسیاسی و خراپە و نابێت ئەو بریارە تاکە کەسێك بیدات، بەڵام لەو کاتەدا تەقینەوەکە روی نەداو پاش ئەو بەیانەش نوێنەرەکانی حزب کەتاڵەبانیان تێدابوو چونە بەغداو چاویان بە تاهیر یەحیا کەوت و ئەویش هیچ شتێکی بۆکورد نەسەلماند(٥٠). لەگەڵ ئەوەی لەناو حزب کاریاندەکرد وەڵ کاری خۆشیانکردوە و زەمینە سازیەك هەبوە بۆ جیابونەوە، تاڵەبانی لەگەڵ ئەم کارانەیدا تاك لایەنە هەوڵی کۆکردنەوەو پەیوەندی دروستکردنی داوە بۆ بەهێز کردنی تیمەکەی خۆیان لە ناو حزبدا، ئیبراهیم ئەحمەدیش دوور لە دەسەڵاتی بارزانی لەناوچەی سلێمانی دانیشتوەو هەوڵی داوە کەمترین کات بچێتە ژێردەسەڵاتی بارزانی لەناوچەی چۆمان.رەنگە کەمی چونی ئیبارهیم ئەحمەد بۆژێرە دەسەڵاتەکەی بارزانی پەیوەندی بەوە هەبوبێت ترسی هەبوە کە دەستگیری بکات یاخود لەناوی ببات بۆیە هەمیشە خۆی پاراستوە لێی، بیانوەکان و نیگەرانیەکانی مەکتەبی سیاسی رۆژ بەرۆژ لە هەڵکشاندابوە، بارزانی باکی بەو نیگەرانیانە نەبوەو لە لوتکەی دەسەڵاتدا سەرقاڵی کارەکانی

خۆی بوه، هەوڵی نەداوه زەمینەی کارکردنی تیم برەخسێنێت و ئەوەی مەبەستی بوه فەرمان ڕەوایی یەکلایەنەبوه و ئەو خەونەشی بەدەست هێناوه، پێشی وابوه دەرچونی هەرتیمێك لە ژێر فەرمان رەوایی ئەودا دەرچوونە لەهەموو بنەماو پرنسیپەکانی خەباتی کوردایەتی، بەیانناممەکەی باڵی مەکتەب سیاسیش ئەوه دەرئەخات بارزانی لەم حاڵەتە ژیاوه بۆیە ئەوان دژی وەستاونەتەوه.

پاش گەرانەوەی نوێنەرەکانی حزب و شکستی دانیشتنەکەیان بارزانی بۆ قەرەبووکردنەوەی هەڵەی شەر راوەستانەکەی دژی ئەو دەسەلاتە نوێیەی عێراق لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی لەشاری رانیە لەبەرواری" ٢٨_ ٢_ ١٩٦٣ " باسی لە راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی کردوەو دژی سەفەرەکەی تاڵەبانی بوه بۆ میسر(٥١) هەڵبەتە تاڵەبانی بەبێ پرسی بارزانی و مەکتەبی سیاسی راستەوخۆ لەبەغدادەوه بەرەو میسر دەچێت و چاوی بە جەمال عەبدولناسر دەکەوێت و ئەمەش بارزانی نیگەران دەکات، جموجوڵی سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی تاڵەبانی بۆ دروستکردنی بەرەیەکی دی بەردەوام بوه، پارتیش لەئەدەبیاتی خۆیدا ئەم جموجولانەی بەخیانەت تەفسیر کردوه،

لەکاتێکدا ساڵی" ١٩٦٦ " روینەداوەو تاڵەبانی وەك سیاسیەکی ناو گۆڕەپانەکە مافی خۆی بوە جموجوڵی سیاسی بکات و خۆی دەربازبکات لەفەرمانەکانی بارزانی، بۆیە بیَ گەڕانەوە چوەتە میسر تاکو هەوڵی کردنەوەی دەرگای تر بدات بەروی خۆی و تیمەکەیدا و ویستویەتی پاڵپشتی بۆخۆی و باڵی مەکتەبی سیاسی بەدەست بهێنێت و بارزانیش بۆ چارەسەرکردنی هەڵەکەی هەرەشەی لە دەوڵەتی عێراق کردوە ئۆتۆنۆمی رادەگەیەنێت و ئاگر بەست کۆتای پێدەهێنێت. پاش ئەمە نوێنەری عێراق دێتە ناوچەی چۆمان و چاوی بەبارزانی دەکەوێت و بارزانیش یاداشتێك دەداتە حکومەتی عێراقی، ئەم هەنگاوە تاك لایەنانەی بارزانی باڵی مەکتەبی سیاسی تورە ئەکات و ئێرانیەکانیش لەم هەنگاوانە قەڵس ئەبن، بەلاًم بارزانی لەگەڵ ئیسرائیلیەکان و ئەمریکایەکان رێکەوتوە بۆئەوەی لەرێگەی دانوستان و فشارەکانی ئەوانەوە شتێك بەدەست بهێنێت لە حکومەتی عێراقدا، حکومەتە نوێکەی عێراقیش ئەم کاتانە بەهەل دەزانێت بۆئەوەی باشتر خۆی کۆبکاتەوەو دەسەلاًتی بەسەر شارەکانی عێراقدا زۆرتر بکات، گروپەکەی مەکتەبی سیاسیش بەنیازن بەهۆی پشتگیریکردنی ناوخۆو دەرەوە تۆپەکە بگوازنەوە بۆلای حزب و لەدەستی بارزانی دەری

بهێنن، هەرلەم سەرو بەندەدا مەسعود بارزانی لەرێگەی ساواکی ئێرانەوە دەگوازرێتەوە بۆ ئیسرائیل و لە کۆرسێکدا راهێنانی پێدەکەن لەسەر کاری نهێنی و بەرێوە بردنی دەزگای نهێنی(٥٢). بە پێی بۆچونی ئەفسەرەکانی ئیسرائیل ناوچەکانی کوردستان پێویستی بە دەزگایەکی سیخوری هەیە بۆئەوەی زانیاری لەسەر هەموولایەك کۆبکاتەوەو هەماهەنگی بکات لەگەڵ دەزگا سیخوریەکانی ساواك و مۆسادا، لەگەڵ گەرانەوەی مەسعود بارزانی و نەخشەی ئیسرائیلیەکان لەساڵانی نیوەی شەستەکاندا دەزگای " پاراستن " دادەمەزرێت، یەکەم بەرپرسی ئەم دەزگایە کورەکەی بارزانی دەبێت و مەکتەبی سیاسی حزبیش نیگەرانن لەم هەڵسوکەوتەو دەیانەوێت کەسێکی بەئەزمون سەرپەرشتی ئەم دەزگایە بکات و ببێتە شوێنێك بۆکۆکردنەوەی زانیاری، بەس بەتێکەڵکردنی دەستی بارزانی لەناو حزب راستەوخۆ ئەم دەزگایە دەبێتە پایەك بۆپاراستنی بارزنی و خانەوادەکەی. ئیدی کاتێك بارزانی و کورەکانی دەستیانکرد بە کۆنترۆڵکردنی حزب ناکۆکیەکان تەقینەوە و لە ساڵی "١٩٦٤" باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی بەیاننامەیەکی دژی بارزانی بڵاو کردوەو بەوە تۆمەت باریانکردن لەبەرژەوەندی عێراق و ئێران کار دەکات و راگرتنی شەرەکەشیان لەگەڵ عێراق

بۆئەوەگەڕاندەوە کە بارزانی لەبەرژەوەندی دەوڵەتەکان کار دەکات و دەیەوێت عێراق ببێتە دەوڵەتێکی بەهێز و هەموو ئەو هەڵانەی لەو ماوانەی پێشودا لەسەرکردایەتی سیاسی کرابوون خستیانە پشت بارزانی، مەکتەبی سیاسی لەبەیاننامەکەیاندا بارزانیان بە نوێنەری عێراقیەکان وەسف کردوە بەو جۆرە تەماشاین کردوە لەپێناو بەرژەوەندی خۆی و خێزانەکەی کار دەکات و هەنگاوەکانی خزمەت بەکورد ناکات، بارزانیش لای خۆیەوە بڕیار دەدات هێزکۆبکاتەوە و شەڕی براکوژی دژی ئەو باڵە بەرپابکات، لەگەڵ کۆکردنەوەی هێزیشدا بارزانی و دەزگاکانی راگەیاندنی ژێر دەسەلاتی ئەو بەهەمان شێوە ئەوانی تۆمەتبارکرد بە لادەرەو دەستی بێگانەو لێکترازانەکە دەستی پێکرد، لەگەڵ لێکترازانەکەدا ئێران تێگەیشت ئیدی کاتی ئەوە هاتوە بەشوێن رێگە چارەیەکی تردا بگەرێت. " بەرلەوەی بارزانی ئاگر بەست لەگەڵ عێراق رابگەیەنێت و باڵی مەکتەبی سیاسی بەتەواوەتی جیا ببنەوە، ئێرانیەکان باوەریان بەوە هەبوە پشتگیری بارزانی بکەن و جۆرێك لەفەرمان رەوایەتی لەم ناوچەیە دامەزرێنن کە فەرمان رەوایەتیەك بێت بۆ بەرژەوەندیەکانی ئێران باشبێت و ئێران ئاراستەی بکات،

کاتێکیش زەمەنەکە گۆڕانی بەسەردا هاتوە ئێران پشتی لەو پرۆژەیەکردوە".

پاش ئەوە بارزانیش راستەوخۆ شەری راگەیاند لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی و رێگەی نەدان لەکۆنفرانسەکەی خۆیان لە ماوەت کارە سیاسەکانی خۆیان ئەنجام بدەن، لەگەڵ هەڵکوتانە سەریان شەر هەڵدەگیرسێت، هێزەکانی مەکتەبی سیاسی لەناچاریدا سنووری کوردستانیان بەجێهێشت و پاڵیاندا بە دەوڵەتەکانی ترەوە، گروپی بارزانیش ئەمەیان بەخیانەت حسابکردو یەك هێرشی راگەیاندنیان دژی باڵی مەکتەب سیاسی دەستپێکرد، لەگەڵ شەرەکانیشدا هێرشی تۆمەت دروستکردن بۆسەر یەکتری بەشێکی سەرەکی شەرەکە بوو، ئەدەبیاتی ئەو سەردەمەی هەردوولا پێمان دەڵێت حزب یەکەمین هێزە خراپترین تۆمەت دەهێنێتە ئاستی سیاسی و بەخراپترین شێوە مامەڵە لەگەڵ یەکتری دەکەن، مەسعود بارزانی لەکتێبەکەی خۆیدا کە لەم دوایەدا بڵاوی کردەوە لەو بەشەی باسی ئیبراهیم ئەحمەد دەکات زیاد لە "٢٣٠" قسەی ناشیرین دەرهەق بە ئیبراهیم ئەحمەدو تاڵەبانی دەکات و بە بناغەی ناکۆکیەکانیان تەفسیردەکات، باڵی مەکتەبی سیاسیش بارزانی بە بناغەی

شکستەکانی کورد تەفسیردەکەنو لەسەدەی نوێدا یەکەم شەری ناوخۆ لەلایەن ئەو دوو گروپەوە دەست پێدەکات، شەرەکەش لەسەر بنەمای یەکتر قبوڵ نەکردن بوە لەناو حزبدا نەك لەسەر خراپ تێگەیشتن لەسەر چەمکەکانی نەتەوەو ئایندەی کورد. بارزانی بەهاوکاری لایەنگرەکانی هەڵمەتێکی لەکەدارکردن دژ بەو گروپە دەست پێدەکات و چەمکی جاشایەتی مانایەکی فراوانتر و گشتگیرتر وەردەگرێت، باڵی مەکتەب سیاسیش بەهۆی کەمی لایەنگر و دەزگاری راگەیاندنی بەهێزەوە شەرەکەیان تائەو شوێنە کردوە کە لەتوانایاندا بوەو بەرامبەرەکەی خۆیان بەخیانەتکار تەفسیر کردوە.

لەگەڵ دروست بوونی شەرەکەدا ناوی " جەلالی و مەلایی" پەیدابوو ئیدی بارزانی بۆچارەسەرکردنی قەیرانەکانی ناو حزب راستەوخۆ داوای بەستنی گۆنگەری شەشەمی پارتی کردەو کۆمەڵێك کەسی ناو حزبی شویعی و گروپێکی تری دروست کردوە بۆ پرکردنەوەی ئەو بۆشایە حزبیە کە دروست بوە (٥٣). لەم کۆنگرەیەدا خۆی بەسەرۆك هەڵبژاردو دوو کورەکەشی هێنایە ئاستی سەرکردایەتی حزب.لە مانگی ٢ هەمان ساڵدا ئیدی بەتەواوەتی شەر لەنێوان هەردوو باڵەکەدا

هەڵگیرسا و دەیان کەسی کورد بۆماوەیەکی درێژ لەو شەری دابەشکردنی دەسەڵاتەدا کوژران، بارزانی بۆیەکلایی کردنەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی لە"١٠ _٢_ ١٩٦٤" ئاگربەستی لەگەڵ حکومەتی عێراق راگەیاند(٥٥). ئەم ئاگر بەستەی بارزانی لەگەڵ عێراق بۆئەوە بوو لەیەك کاتدا دووشەر ئەنجام نەدات و یەك بەرەی شەر دروست بکات، عێراقیش پێویستی بەوە بوو خۆی کۆبکاتەوە ئەم ئاگر بەستەی پێخۆش بوو بۆیە لەوکاتەی بارزانی سەرقاڵی شەر بوو لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی عێراق سەرقاڵی مەشق و کۆکردنەوەی سوپا بوو بۆشەرێکی دی لەناوچەکەدا، کاتێك شەرەکانی کورد لەنێو خۆی خۆیان بەردەوام بوو عێراق دەستوری خۆی بلاّو کردەوەو بەهیچ جۆرێك لەو دەستورە ناوی کورد نەهاتوەو ئەو مافانەی قاسم لەدەستوردا چەسپاندبووی هێزە نوێکەی عێراق سریانەوەو دەستورێکی بێ مافی کوردیان دەرکرد، بارزانی و باڵی مەکتەبی سیاسیش سەرقاڵی شەرکانی خۆیان بوون و باکیان بەوە نەبوو لەعێراقدا چی رودەدات و هەریەکەیان لای خۆیەوە هەوڵی سرینەوەی ئەویتری داوە، دوای ئەوەی لەشاری رانیە لەکۆنگرەی شەش بارزانی خۆی کردەوە بەسەرۆکی حزب پەلاماری بارەگاکانی مەکتەبی سیاسی لەماوەت داو چەن کەسێك کوژران و بریندار بوون، شەری ئەم

دوو تاقمە بەبێ هیچ گومانێك لەبەرژەوەندی کورد نەبوەو لەبەرژەوەندی عێراق و ئێراندا بوە، هەردوو دەوڵەت راستەوخۆ لەرێگەی ئەم تاقمانەوە دەستیان خستوەتە ناو شەرەکەو هێزی خۆیان لەگۆڕەپانەکەدا تاقی کردوەتەوە، بۆیە لەو سەرو بەندەدا کوردە دانیشتوەکانی دەرەوەی ئەم دوو تاقمە ئەم کردەوانەیان پێ باش نەبوە بۆیە هەر لەو سەروبەندەدا مانگرتنێك لەزۆربەی شوێنەکانی کوردستانی باشور رویدا دژی شەری هەردوولا و وەزیری ناوخۆی عێراقیش رایگەیاند کورد هیچ مافی نیەو دەبێت چەکەکانیان دانێن، بارزانی و باڵی مەکتەبی سیاسیش لەبری هەر هەنگاوێك بۆکورد بیریان لە کۆتایی هێنانی یەکتر دەکردەوە.و هیچ لایەك وەڵامی وەزیری ناوخۆی عێراقیان نەداتەوە.

پاش ئەوەی بارزانی سەرکەوت لەو شەرەدا باڵی مەکتەبی سیاسی بەرەو ئێرانە هەڵهاتن و سوپای نوێی عێراقیش هەڵی کوتایە سەرناوچە کوردیەکان و لەزۆربەی شارەکانی کوردستان خەڵکیان دەستگیرکرد و کوشتنیان. پاش ماوەیەك تاڵەبانی گەرایەوە کوردستان و ئیبراهیم ئەحمەد لەئێران مایەوە، تاڵەبانی لەگەڵ گەرانەوەی وچویە ناوچەی چۆمان و چاوی بەبارزانی

کەوت و ناکۆکیەکانیان تاماوەیەك کۆتایی پێهات." دەبێت خوێنەر ئەوەی بیر نەچێت ساڵی ١٩٦٦ ئیبراهیم ئەحمەد لەگەڵ تاڵەبانی نەبوەو هەر لەئێران بوەو ئەو رێکەوتنە پەیوەندی بەتاڵەباینەوە هەیە و ساڵانی پاش ١٩٦٦ ئیبراهیم ئەحمەد لە ئێران دەگەڕێتەوە". تاڵەبانی لەژیانی سیاسیی خۆیدا چەنجارێك تەسلیم بوون و شکستی بەخۆیەوە بینیوە، دوای شەست و چوار جارێك بەلاوازی چوەتەوە لای بارزانی و پاش شەست و شەشیش چوەتەوە پاش نەودو یەکیش چوەتەوە، ئەم شکستانەی تاڵەبانی بۆخۆی بەسەرکەوتن تەماشای کردون بەلاّم لەکایەی سیاسیدا بە شکست و لاوازی تەفسیر دەکرێت.، بارزانی خۆی بەسەرکەوتو دەزانی و شەری لەگەڵ عێراقیش دەست پێکردەوە، لە" ٢٥_٩_ ١٩٦٥" شاحوسێنی ئوردن لەسەر داوای عێراق سەردانی ئێرانی کردو داوای لەشای ئێران کرد دەست لەیارمەتی دانی کورد هەڵگرێت(٥٦). ئەم سەردانەی شا حوسێن بوییە هۆی کەمتەرخەمی شا دەرهەق بە یارمەتی دانی بارزانی و بارزانیش دەرگای سۆڤیەتیەکان و ئیسرائیلیەکانی گرت تایارەمەتی بدەن شەرەکە لەگەڵ عێراق بەردەوامی پێبدات.پاش ئەمە لەساڵانی" ١٩٦٦ "گروپەکەی تاڵەبانی جارێکی تر چونە پاڵ سوپای عێراق و گروپی

بارزانیش پاڵ ئێران، ئیدی هەردوولا شەڕی دەوڵەتەکانیان دەکرد دژ بەیەکرتی، لەم نێوانەدا هەزاران کورد بونە قوربانی و هەزارانە گوند سوتێنران و هیچ کام لەو دوو لایە ئامادەنەبوو دەست لە پاڵپشتی دەوڵەتەکان وەردات، بۆیە عێراق لەبەیاننامەیەکدا نیگەرانی خۆی دەربری دژ بە ئێران کە یارمەتی بارزانی دەدات، ئێرانیش هەمان کاری کرد و نیگەران بوو لەوەی عێراق یارمەتی تاڵەبانی دەدات، کوردستان بویە گۆرەپانێك بۆیەکلای کردنەوەی شەرەکان و هێزەکانی بارزانیش لەزۆربەی شوێنەکان گورزی مەترسیداریان لە سوپای عێراق دەداو هێزەکانی تاڵەبانیش سوپای عێراقیان دەبردە سەر ئەو شوێنانەی هێزەکانی بارزانی تێدابوو، هەرچۆن پاش _٣١_ ئاب ئیدی ئەوە دەوڵەتەکان بوون لەناوچەکەدا شەریان دەکرد و نێوانی هەولێر و سلێمانیان کردبویە نێوان یەکلای کردنەوەی هێزی خۆیان بەهەمان شێوەش لەساڵانی شەستەکان ئەو مۆدێلە بوونی هەبوو، دەستگرتنی سوپای بێگانە بۆناوچە کوردیەکان ئەرکی باڵەکانی حزب بوو، هیچ کام لەو دوو باڵەی جەلالی و مەلایی بە بێ یارمەتی دانی هێزێکی دەرەکی نەیان دەتوانی ئیدامە بەشەرەکانی خۆیان بدەن، یەکتر سرینەوە و لەناو بردنی یەکتری و دابەشکردنی کارەکتەری کوردی بەسەر دوو رەنگدا

بناغەکەی لە ئەیلولەوە دەستی پێکرد و ساڵی "٩٦٤" یەکەم ساڵی دەرکەوتنی ئەو حاڵەتەیە" گەڕانەوەکەی تاڵەبانی لەئێرانەوە بۆ لای بارزانی گەرانەوەیەك نەبوە تاکو لەژێر سێبەری ئەودا کار بکات، بەپێی هەوڵەکانی و جموجوڵەکانی دەردەکەوێت ویستویەتی لەودەرگایەوە هێزەکانی خۆی کۆبکاتەوەو بچێتەوە پاڵ هێزەکانی بەغداد و بە پاڵپشتی ئەوان تۆڵەی تێکشکانەکەی خۆی لەبارزانی بکاتەوە، هەرئەمەشی کرد گەرچی سەر نەکەوتوە"، هەڵبەتە لەمێژووی نوێی کوردی کە حزب بەرپرسە لەم مێژووە ئەم دیاردەیە بویە بناغەیەك لەمێژووی رابردو، هەرچەندە ئەم کارە رەگوریشەکەی لەوەی قوڵترە لێرەدا بەدرێژی باسی بکەین، بەلاّم مێژووی نوێمان خۆی خولقێنەری ئەم کارەیە نەك کەسێکی دەرەکی. ڕەنگە "ئەگەر "خستە بەردەم مێژوویەك کە تێپەریوە لەروی لۆژیکی مێژوویەوە کارێکی هەڵەبێت، بەلاّم بۆخۆی پرسیارەو دەبێت سەردەمی پاش ئەو مێژوە وەلاّمی ئەو ئەگەرە بدابتەوە تاکو روداوەکان دووبارە نەبنەوە.

کە بارزانی زانی ئیدی فشارەکانی عێراق زیادی کردوە بەسەرۆکایەتی سامی عەبدلرەحمان لە مانگی" ٣ _ ١٩٦٩ "

هێرشێکی بەڵاو بەر بڵاوی کردە سەر کارگەی نەوتی کەرکوک و زیانی ٢ ملیۆن دۆلاری لێدا(٥٧). ئەم هێرشەی بارزانی بۆسەر کارگەی نەوت نیگەرانی لای ئەمریکا و شا دروست کردو ئەمریکایەکان هەستیان بەوەکرد لەم هێرشەدا لەبەرژەوەندی ئەوان دراوەو لەوکاتەدا ئەمریکا هاوکاری هیندەکانی دەکرد و پرۆژەیەکیش هەبوو بۆهاوکاریکردنی کورد لە ٥ ملیۆن دۆلارەوە بۆ ٧ ملیۆن دۆلار و شا لای خۆیەوە پارەکەی زیاد کردبوو بۆنزیکەی ١٥ ملیۆن دۆلار، بەس پاش ئەم هێرشە نیگەرانیەکانی ئەمریکا و مەترسیەکانی ئەیلول بۆسەر بەرژەوەندیەکانیان وای کرد ئاراستەی مەسەلەکان بەتەواوەتی بگۆرێت و هۆشداریان دایە بارزانی کە هێرش بۆسەر بەرژەوەندیەکانی ئەوان نەکات، بارزانیش لەپەرچە کرداری ئەم کارەیدا پێی خۆش بوو دانوستان لەگەڵ حکومەتی عێراقی بکات و گروپەکەی تاڵەبانیش هەموو دانوستانێکی بارزانی و عێراقیان بەمەترسی دەزانی بۆسەر خۆیان بۆیە هەمیشە هەوڵی ئەوەیان دەدا شەر بەردەوام بێت و فشار بخەنە سەربارزانی ناوچەکانی دەسەڵاتی خۆی بەجێبهێڵێت. لە ساڵانی رابردوەوە تاکو ساڵانی راپەرین هەر هێرشێك بۆسەر نەوتی کەرکوك لە بەرژەوەندی کوردا نەبوە، سەردەمی ئەیلول کە بارزانی ئەو هەڵەیەیکرد

باجەکەشی بە ئاش بەتاڵ وەرگرتەوە، لەسەردەمی سەرهەڵدانی نوێدا کە یەکێتی ئەو هەڵەیەی دوبارەکردەوە باجەکەی بە ئەنفالکردنی ناوچە کوردنشینەکان دا، لەبەر ئەوەی لێدان لەو شوێنە لێدان نەبوە لە عێراق بەڵکو لێدان بوە لەبەرژەوەندی زۆربەی دەوڵەتەکان بەتایبەتی ئەو دەوڵەتانەی دۆستی کورد بوون. بارزانی پاش تێپەرینی کۆمەڵێك روداو دەرکی بەوە کردوە پاڵپشتیەکانی کەم بونەتەوە هەوڵی ئەوەی داوە لەرێگەی رێکەوتنێکەوە شتێك بەدەست بهێنێت هەم بیکاتە دەستکەوتێکی نەتەوەی و هەم رێگەچارەیەك بێت بۆ ئایندەی جولانەوەکەی و خۆشی لەو قەیرانانە دەرباز بکات هاتبونە رێگەی.

لەگەڵ هێرشەکاندا نوێنەرێکی دەوڵەتی عێراقی بەسەرپەرشتی فواد عارف چوە ناوچەکانی نێوپردان و بارزانی بینی و داوای دانیشتنی کرد لەبارزانی(٥٨). بارزانیش لای خۆیەوە رازی بوو ئەمەی بەهەل زانی یەك تەرەفە شتێك بەدەست بهێنێت و ببێتە دەستکەوتێك بۆی و کۆتایش بە باڵی تاڵەبانی بهێنێت، بەلام ئێرانیەکان بەمە نیگەران بوون و داوایان لەبارزانی کرد بەبێ گەرانەوە بۆلای ئەوان هیچ دانوستانێك ئەنجام نەدان بەس بارزانی گوێی لەم قسەیە نەگرت و دەستیکرد بە دانیشتن لەگەڵ

عێراقیەکان و ئەنجامی دانیشتنەکەش بەوە کەوتەوە بەیانی ١١ ئازار لەنێوان هەردولادا ئیمزا بکرێت، کەبەیانەکەش ئیمزاکرا ئیدی شا بەتەواوەتی پشتی لە بارزانی کردو بەمەترسی زانی بۆسەر ولأتەکەیی بۆیە لەرێگەی وەزیری دەرەوەی جەزایر دانیشتنێکی ٣ قۆڵی ئەنجام درا و لەبری کەنداوی فارس پشت لەکورد بکات، شا کەنداوی فارسی بۆ ئێرانیەکان وەرگرتەوەو لەبری ئەوەی ئەیلولی دایە دەست عێراقیەکان، رێکەوتنەکەی ئەم سێ لایەنە راستەو خۆ هەرەسی بە بارزانی هێنا و بەبێ هیچ بەرگریکردنێك کۆتایی شۆرشەکەی راگەیاند و بەیانی ١١ ئازاریش هیچ گرنگی نەماو هەرەسەکەی گشتی کرد بۆکورد و رێگەشی نەدا هیچ کام لەهێزەکانی حزب دەستبکەنەوە بەشۆرش و ئەمەی بەمەترسی زانی بۆسەر خۆی.

دانیشتنە سێ قۆڵیەکان لەشوێنیکی دی بوون کەچی لەشوێنێکی دی ئەیلول هەرەسی بەخۆی هێنا، پەیوەندیشی بەوە هەبوو دینەمۆی هەڵگیرساندنەکە شابوو، کاتێك شا دەست لەم هەڵگیرساندنە هەڵدەگرێت ئیدی بارزانی لەوە تێگەیشت کۆتای یاریەکە هاتوە و بەبێ پشتگیری ئەو هیچ کارێکی پێناکرێت، پێش بەیانەکەش ساڵی" ١٩٧٠" بارزانی و تاڵەبانی

ئاشت بونەوەو کۆتایان بە ململانێکانیان هێنابوو، بەڵام ئەمە نەبویە هۆی ئەوەی بارزانی یەك تەرەفە بریار نەدات لەسەر چارەنوسی حزب و خەڵك. کەروی کردە ئێرانیش راستەوخۆ لە رۆژنامەکانی ئێران باسی لەکۆتایی هاتنی ئەرکی خۆی کرد و ئەو چەند ساڵەی بە ئەرکێك چێواند کە جێبەجێیکردەوەو ئیدی کۆتایی پێهێناوە، ململانێکانی ناوخۆش رەگوریشەیان داکوتی و میلەتێك کەوتە ناو گێژاوی هەڵەکانی دوو تاقمی سیاسیەوە کە جگە لەکوشتن و ماڵ وێرانی هیچ شتێکی گرنگیان لەدوای خۆیان بەجێنەهێشت، ئەگەر مەزنی ئەیلول ئەوە بوبێت شەر بویە بەشێکی ژیانی کوردی ئەم ناوچەیە ئەی نامەزنی ئەم شۆرشە چی بوە؟ ئایا ئەگەر شۆرش پاش خۆی وێرانەیەك بەدجێ بهێڵێت و ژیانی میلەتێك بخاتە مەترسیەوە سیاسیەکانی بۆخۆیان بچنەوە ماڵەکانی خۆیان لەوڵاتانی دەرەوە ئەم شۆرشە ئەکرێت بەمەزنی تەماشابکرێت؟ گەر سیاسیەکانی کورد مەزنانە تەماشای کوردیان دەکرد هۆی چی بوو ئەو لێکترازانە رویداو چەندین ساڵ شەریانکرد لەسەر ئەوەی کامیان زیاتر دەسەڵات بگرێتە دەست و دەسکەوتەکان بۆکامیان بێت؟ گێرانەوەی دیوە تاریکەکەی ئەم مێژووە پێمان دەڵێت ئەمانە دینەمۆیەك بوون بۆ وێرانی نەك دەرگایەك بۆ ژیانێکی باشتر ؟ کاتێك بارزانی خۆی و

خێڵەکەی گواستەوە بۆ شوێنێکی باش لەئێران بۆچی بیری لەو کوردانە نەدەکردەوە کە کەوتنە دەست هێزەکانی عێراق و ژیانیان کۆتایی هات، شەری بارزانی لەسەر وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی حزب شەرێك بوو پەیوەندی بەکوردەوە بوو یان پەیوەندی بەبەرژەوەندی تاکە کەسیەوە بوو؟ ئەی دەستکەوتەکانی ئەیلول چین بۆکورد؟ پێش مۆرکردنی بەیانی ١١ ئازار کە ئەو هەمووماڵوێرانیەی لەسەر کرا لەسەردەمی قاسمدا هەمان دەسکەوت بۆکورد بەدەست نەهاتبوو کورد پێی رازی نەبوو؟ مامەڵەکردن لەگەڵ قاسم باشتر بوو یان مامەڵەکردن لەگەڵ شای ئێران؟ کورد لەبری ئەوەی لەسەردەمی قاسمدا بچێتە شاخەکان بچوایەتە ناوحکومەتەوە باشتر نەدەبوو؟ زەرورەتی ئەیلول چی بوو لەکاتێکدا حکومەتی قاسم ئامادەیی تیابوو بۆئەوەی هەموو مامەڵەیەکی تەندروست لەگەڵ داواکانی کوردا بکات؟ ئەی کە هێزێکی چەکدار شکستی هێنا بۆ گشتگیرکراو کرایە شکستی میلەتێك؟ بۆقەت روینەداوە لەساڵی "١٩٦٠" وە تاکو ئێستە پارتی وەك حزبێك بەبێ پاڵپشتی هێزەکانی دەرەوە بچوکترین هەنگاوی سیاسی و نەتەوەیی بنێت، باسکردنی ئەو پەیوەندیانە مەترسیە یان دەرخستنی راستیەکە؟ گرنگە مێژوو نوسەکان کاری لەسەر بکەن، کێ

پاڵەوانی شۆڕشەکە بوو بارزانی یان شای ئێران؟ گەر بارزانی بوو بۆچی سەرنەکەوت و بە پشتکردنی شا لەشۆڕشەکە شکست دەستی پێکرد؟ نەوەی نوێ دەیەوێت مێژوو بەشکست و خیانەت و هەڵسانەکانیەوە بخوێنێتەوە یان تەنها بەشوێن دیوە روناکەکەی مێژوە وێڵە؟ ئەگەر رۆحی کورد رۆحێکی بێ ئیرادە بوایە دوای ئەیلول سەرهەڵدان دەستی پێدەکردەوە، ئەوەی لەماوەی ٨٠ ساڵی رابردودا رویدا شۆڕش بوو؟ چیبکەین بۆئەوەی خوێندنەوەیکی تەندروستیش بۆ بەیانی ١١ ئازار بکەین؟

بۆچی ئەیلول نەبویە چەترێك بۆکۆکردنەوەی هەموو رەنگەکان؟ بارزانی ویستی جارێکی دی کورد هەڵسێنێتەوە یان جارێکی دی کوردی تێکشکاندەوە؟ ئەگەر لەبری بەیانی هەرس بەیانی شۆڕشی چەکداری لەناوچە شاخاویەکان بلاّو ببوایەتەوە هیچ کام لەهێزە دەرەکیەکان دەیانتوانی کۆتای بەو بەرگریکردنە بهێنن؟ یان ئەم شۆڕشە بەبێ دەستی دەرەکی نەیتوانی هەنگاو بنێت بۆیە مەرگی خۆی راگەیاند؟ ئەوکاتەی بەیانی هەرەس بلاّو دەبێتەوە دەستەیەك لەگەڵ عەلی عەسکەری باس لەوەدەکەن شۆڕش کۆتای نەهاتوەو دەست پێدەکاتەوە ئەم هەواڵە بارزانی

نیگەران دەکات و پێیان رادەگەیەنێت کۆتای شۆرش هاتوەو بۆکەسی دی نیە شۆرش بکاتەوە چونکە بریاری هەڵگیرسان و کوژاندنەوەی لەدەستی منە نەك هیچ لایەك، بەپێی کتێبەکەی " دیڤد کۆرنی ئەمریکی" ئەو کاتەی شا لە دانیشتنەکە دەگەرێتەوە بۆ ئێران هەر لە فرۆکەخانە بەرپرسە سەربازینەکان کۆدەکاتەوەو پێیان رادەدەگەینێت ئەو هاوکاریانە بوەستێنن بۆ بارزانی دەچون، پاش ئەوەش زەمەنێکیان بدەنێ پاش ئەو زەمەنەش سنوورەکانیان بەسەردا دابخەن، بۆیە بارزانی و شەفیق قەزازو دکتۆر مەحمود عوسمان دەچنە لای شا، چەند رۆژێك چاوەرێدەکەن تا شا ببین، شاراستەوخۆ پێیان دەڵێت " کارەکەی ئێوە تەواو بوەو ئیدی پێویست ناکات بەردەوام بن" بارزانی لەم دانیشتنەدا هیچ قسەیەك ناکات و دکتۆر مەحمود وەڵامی شا دەداتەوە، کەدێنە دەرەوە ئیدی دکتۆرەکەی بارزانی نیگەران دەبێت و پاش ئەو دانیشتنە دەست لەپارتی هەڵدەگرێت و لەکتێبێکی رەخنەیدا رەخنە لە پارتی و بارزانی دەگرێت، لەگەڵ گەرانەوەشیان بارزانی لەرۆژی یەکەمی کۆبونەوەی سەرکردایەتی حزب لەچۆمان ئومێدی هەیەو باس لەبەردەوامی دەکات و نوێنەرەکانی کە لەگەڵی بوون تێناگەن لەم حاڵەتە، بەلآم پاش دوو رۆژ باس لە کۆتایی هاتن و ئاش بەتاڵی

شۆرش دەکات، لەو ماوەیەدا دووجار لەتارانەوە پەیوەندی پێوەدەکرێت و ئاش بەتاڵەکە و کۆتای هاتنەکە پەیوەندی بەو دوو پەیوەندیەوە هەبوە کە لە ئێرانەوە لەگەڵی کراوە، ئەوانەش دەیان ویست بەردەوام بن کۆتایان پێهات" نیگەرانیەکەی بارزانی لەو گروپە مانای ئەوەیە بارزانی ویستی شۆرشی نەبوە بەڵکو ویستی تاکە کەسی هەبوە هەمیشە ترسی لەوە بوە دەستکەوتێك بەبێ ئەو بێتە دی بۆیە هەر لەساڵی ١٩٧٦ کە شۆرشێکی دی بەنوێنەرایەتی کۆمەڵێك گەنج و تاڵەبانی هەڵدەگیرسێت ئیدی نەوەکانی بارزانی بەهاوکاری ئێران دەست دەکەنەوە بە دژایەتی کردنی ئەو نەوەیەو لە کارەساتی هەکاریدا زۆرێك لەو شۆرشگێرانە کۆتای پێدەهێن و ئەوەندە شەر لەگەڵ ئەو شۆرشە نوێیە دەکەن ئەوەندە شەر لەگەڵ هێزە داگیر کەرەکان ناکەن، سەرکردایەتی حزبی خۆشیان دەبەنە ناو قولایی ئێران و هێزەکانیشان بەناوی" قیادە مۆقەتە" رەوانەی کوردستان دەکەن بۆ رێگەگرتن لەهەر هەڵگیرسانەوەیەکی شۆرش، دووبارەکردنەوەی مێژووی ئەیلول بۆ پارتی دوبارەکردنەوەی هەمان دیدی پێشوبوو، حزبێك خۆی راهێنابوو لەسەر بنەمای ئەوەی کە هەمیشە یەك رەنگ دەبێتە بالادەست و رەنگەکانی دی کار بۆ بەهێزکردنی ئەم رەنگە دەکەن و

شکستەکانیشی بەشێکی پەیوەندی بەرەنگەکانی دیەوە هەیەو سەرکەوتنەکانیشی هی تاقە جەمسەرێکە. ئەو خۆ بەزلزانین و خۆ بەشۆرشگێر زانینەی پارتی، لەروی سایکۆلۆژی سیاسیەوە بە گرێیەك وەسف دەکرێت، ئەو گرێیەش کاتێك رودەدات ئەو حزبە یان ئەو گروپە لە مێژووی رابردویاندا شکست و پەیوەندی خراپیان بەرەو روبوبێتەوە، هەر هێزێك لەمێژوەکەی خۆی ترساو تێگەیشت لەرابردوی خۆیدا کاری هەڵەی کردوە بۆقەرەبوو کردنەوەی ئەو دۆخە کۆنە هەڵدەستێت دروشمی دی دەخاتە شوێنی، یەکەمین حزب مانای یەکەمین گەورە ناگەیەنێنیت، گەر بەو دیدەوە تەماشا بکەین پێش ئەو حزبە شویعیەکان هەبوون و بالأدەستیش بوون، بەلأم شویعیەکان یەکەمینی خۆیان ناکەنە گریەك بۆ ئەوەی بەسەر ئەوانی دیدا باز بدەن، هەرچەندە ئەوان وەك حزب کەوتن و کۆتایی بەو ئایدۆلۆژیەتە هات، بەس پارتی چونکە دەزانێت لەرابردوی خۆیدا خەوشی زۆر و پەیوەندی ناتەدروسنی زۆری هەبوە و هەمیشە دەستێکی ئاسنین لەپشتی بوە بۆئەوەی هەڵیسێنێتەوە ئیدی ئەم گریە لەگوتاری سیاسی ئەو حزبەدا بەدی دەکرێت وبەردەوام کاری لەسەردەکات.

# شکست و هەڵسانەوە

## هەڵەی بریار دان

پاش ئەوەی کە ئیدی لەساڵی ١٩٧٠ بارزانی و حکومەتی عێراق رێکەوتنەکەیان ئیمزا کرد و بارزانی وەك دەستکەوتێك بۆخۆی تەماشای ئەو رێکەوتنەی کرد، هەستی بەوە نەکرد کە شا تورە بووە و پێی وابوو شا هاوکاری کوردی کردوە نەك ویستویەتی کێشە لەعێراق دروست بکات، کیسنجەر لەکتێبەکەی خۆیدا باس لەوەدەکات کە شا نیگەران بوە و ئەمریکاش لەبەر ئەوەی پێی باشبو لەوکاتەدا یارمەتی هندستان بدات و یارمەتی لەکوردەکان ببرێت شا کەوتە خۆی( ٥٩) شا لەرێگەی مەلیك حسەین و بۆتەفلیقەی وەزیری دەرەوەی جەزایرەوە داوای دانیشتن لە حکومەتی عێراق دەکات، هەرئەوکاتەی عێراق سەرقاڵی رێکەوتن بوە لەگەڵ بارزانی لەو کاتەشدا سەرقاڵی رێکەوتن بوە لەگەڵ شای ئێران، رێکەوتنەکەی عێراق لەگەڵ بارزانی بۆهێورکردنەوەی ناوچەکە بوەو ویستویەتی گەمەیەکی سیاسی بکات تاکو رێکەوتنەکەی لەگەڵ شای ئێران سەر بگرێت، ئیدی هیچکام لەسەرکردایەتی حزب نەیان توانیوە رێگە

چارەیەك بۆ ئەو جموجوڵەی عێراق دابنێن، هۆکەشی ئەوەبوە ئەوەی خاوەن بریار بوە لەسەرکردایەتی پارتی بەس خودی بارزانی بوە نەك مەکتەب سیاسیەکان و کەسەکانی دی، بارزانیش پێی وابوە گەر لەگەڵ عێراق رێك بکەوێت هەم دەستکەوتێکی سیاسی بەدەست دەهێنێت هەم دەبێتە کارتێکی فشار بۆ شوێنێکی دی و شاش بەم هەنگاوەی رازی دەبێت، شاش بۆئەوەی کەنداوی فارس بخاتەوە سەر ئێران کارتێکی باشی بەدەستەوە بوە ئەو کارەتەش کورد بوە، لەرێکەوتنەکەی جەزائیریش ئەم کارتەی بەکار هێناو ئەوەی ویستی وەریگرتەوە بۆ ئێران. رێکەوتنەکەی شاو عێراق لەجەزائیر لەرێگەی بیرکردنەوەو هەوڵەکانی مەلیك حوسەینی ئەوردنەوە زەمینە سازی بۆکراوە، ئەوکاتەی مەلیك حوسەین لەسەرداوای عێراق سەردانی شادەکات باس لەوەدەکات دەست لەهاوکاری کردنی کوردەکان هەڵگرێت و دەرگایەکی دی بەرووی عێراقدا بکاتەوە، ئیدی شاش لای خۆیەوە دەست لەنەخشە نوێیەکەی کەهاوکاری بارزانی و سەرهەڵدانەکەیەتی هەڵدەگرێت و نەخشە نوێیەکەی دەخاتە گەڕ کە رێکەوتنیەتی لەگەڵ عێراق،

کاتێك مەترسی دەکەوێتە سەر بارزانی بارزانی نامەیەك بۆ ئەمریکا دەنێرێت و داوای پشتگیری لەوان دەکات، کیسنجیەریش لەگەڵ ئەوەی پارتی هێرشی کردە سەر نەوتەکەی کەرکوك ئیدی ئەمەی بە مەترسی بەرژەوەندیەکانی خۆیان زانی بۆیە هیچ وەڵامێکی بارزانی نەدایەوە" خوێنەر دەبێت ئەوە بزانێت بارزانی نوسەری هەبوە و خۆی ئەو خوێندەواریەی نەبوە نامە بنوسێت بۆیە لەهەموو ئەرشیفەکاندا تەنها یەك نامە هەیە بەخەتی خۆی نوسرابێت و ئەمەش لای مێژوونوسەکان بوەتە جێگەی سەرنج(٦٠)" لەگەڵ نزیك بونەوەی شا و عێراق ئیدی بارزانی زانی هیچ دەرەتانێکی نەماوەو هەوڵیدا لەرێگەی ساواکەوە شا رازی بکات بەوەی پشت لە شۆرشەکەی نەکات، بەڵام شا هیچ گوێی بەم داوایەی بارزانی نەدا و رێکەوتنەکەی خۆی لەگەڵ عێراق ئیمزا کرد، لەگەڵ ئیمزاکردنی رێکەوتنەکە بارزانی یەکەسەر هەرەسی هێنا و لەبەیان نامەیەکدا کۆتایی بە شۆرش هێنا، راستیەکەی رێکەوتنەکەی شا لەگەڵ عێراق بۆ کۆتایی هێنان بەکورد نەبوو، بەڵکو شا لەو رێکەوتنەدا تەنها پشتی لە هێزە چەکدارەکانی ئەیلول کردو لە خاڵێکی رێکەوتنەکەدا هاتوە " کەسنورەکان دادەخەین بەسەریان و هاوکاریان ناکەین(٦١)". شای ئێران پێش ئەو رێکەوتنەو پاش

ئەو ڕێکەوتنەش هەرگیز دۆستی کورد نەبەوە وەك نەتەوە، کوردی وەك کارتێکی فشار بەکار هێناوە دژی دەسەڵاتەکەی عێراق، کاتێکیش پشتی لەو جوڵانەوەیەکرد پشتکردن نەبوە بە کورد بەڵکو پشتکردن بوە لەو جوڵانەوەیەی کەخۆی یارمەتی داوەو هەستی بەمەترسیەکانی کردوە، بۆیە کە ئەو جوڵانەوەیە وەستا لای خۆی جێگەی کردنەوە وەك پەنابەر ئەو دەیەویست کۆتای بەئەرکەکە بهێنێت و کۆتایشی پێهنا، بەڵام بەرزانی ئەم پشتکردنەی شای لەهێزە چەکدارەکان کردە هەرەسی سەرتا سەری کوردستان و میلەتێکی خستە ناو دۆخی شەرەکەوە، لەکاتێکدا گەر هێزە چەکدارەکان هێزێکی پشت بەخۆ بەستو بونایە دەیانتوانی لەناوچە شاخاویەکانی کوردستان پەرە بە کارەکەی خۆیان بدەن، بەڵام چونکە هیزێکی پشت بەخۆ بەستو نەبون و لەلایەن شاوە هەموو هاوکاریەك دەکران کە شا پشتی تێکردن پێش ئەوەی هێزە چەکدارەکان هەرەس بهێنن بارزانی و سەرکردایەتی ئەو هێزانە هەرەسی هێنا، هەرچەندە چەند گروپێك هەوڵی ئەوەیان دا دەست بکەنەوە بەخەبات بەڵام بارزانی بەهیچ شێوەیەك ڕازی نەبوو هەموو بەرپرسیاریەتیەکەی خستە سەرشانی خۆی و کۆتایی بەگەمەکە هێنا، ڕەنگە دۆخەکەی ئەوسا و ئێستە جیاوازی تێدا بوبێت بەڵام ئەمە

ناکاتە ئەوەی بڵێن هەمووشت بەو شێوەیە بوە کە حزبەکان لەمێژووەکەیاندا باسی دەکەن، ئەگەر هێزەکەی بارزانی و پەکەکە بەراورد بکەین لەوە تێدەگەین کە هێزەکەی بارزانی لەئەیلول هێزێکی میلیشای خێڵەکەی بێ بنەمابوەو هەموو بریارەکانی بەستراون بەتاقە بیرکردنەوەیەکەوە، بۆیە هەر گورزێك وەشێنرابێت لەو بیرکردنەوەیە ئیدی هێزەکەش گورزی بەرکەوتوە، کاتێك تورکەکان ولآتانی بێگانە رێکەوتن بۆئەوەی ئاپۆ بگرن گرتنی ئاپۆ نەبویە هۆی هەرەس هێنانی هێزی پەکەکەو خەباتی خۆیان کۆتایی پێنەهێناو هەموو دەوڵەتەکانیش رێکەوت بۆ داخستنی سنوور بەسەریاندا و هیچ کاریگەریکەی لەسەر خەباتەکەیان نەکرد، لەبەر ئەوەی هێزێکی سیستەماتێك و باوەر بەخۆی و پشت ئەستور بەخۆی بوو، بەلآم هێزەکەی ئەیلول نە سەرۆکەکەی گیرا بوو نەهێشتا سنوورەکان داخرابون بەسەریدا راستەوخۆ هەرەسی هێنا.

خۆ ئەگەر پەکەکە هەرەسی بهێنایە بەهۆی ئەو رێکەوتنەوەی دژی کرا هەرەسی پەکەکە هەرەسی کوردی باکور نەبوو، بەڵکو تەنها هەرەسی هێزێکی کوردی بوو لە کوردستانی باکور، کەچی بارزانی هەرەسی خۆی و هێزەکەی کردە هەرەسی میلەتێك،

کێشەکە ئەمەیە لەو سەردەمەدا کۆمەڵێك هێزی تر هەبوون وەك حزبی شوێعی و کاژیك و ناسیونالیستە تازەکان نەیان توانی کۆمەڵگە لەوە تێبگەیەنن ئەم شکستە شکستی هێزێکی چەکدارە نەك شکستی میلەتێکی گەورە، هەڵەکەش لەوە دەستی پێکرد ئەوکات حزب لەخزمەتی هێزەکەدا بوو هێزەکەش لەخزمەتی خێڵێك و تاقە بیرکەرەوەیەکدا بوو، بۆیە شکستەکە گشتێنرا بۆکۆی کۆمەڵگە، شکستەکەش لەلاوازی بارزانی و سەرکردایەتیەکەیەوە بوو، لەو کاتەدا دەیان توانی تاقمی تر جیاببنەوە لەشاخەکان بەشێوەی پارتی زانی بەردەوام بن، بەس بارزانی رێگربوە، ئەگینا پاش ئەو هەرەسە کۆمەڵەی رەنجدەران ساڵێك پاش ئەوە دەستی بەخەباتکردوەو توانیویەتی لەو نەخشەیەی دایرشتوە بۆخەبات سەرکەوتوش بێت، بۆچی ئەوان ئەوکارەیان پێکرا بەلآم سەرەکردە سەربازیە بەئزمونەکانی ئەیلول ئەوەیان پێنەکراوە گەر بارزانی رێگر نەبوە؟ چونکە لەنیەرەتدا شۆرشێکی خۆکردەی ئەنجام نەدابوو، بەڵکو دوو دۆخ وای لێکردبوو بکەوێتە ناو گەمەکەوە، دۆخی خێڵەکان و پشتگیری کردنی شا بۆ هێزە چەکدارەکانی، ئیدی کاتێك بویە مەترسی بۆشا بە رێکەوتنێکی سەر مێزەکان ئەو کۆتایی هات، لەگەڵ کۆتایی هاتنەکەشی کە چویە ئێران لەدیدارێکی

ڕۆژنامەوانیدا کۆمەڵێك قسەی کرد کە قسەکانی قورستربوون لە شکستەکەی، لەیەکێك لەقسەکانی لەڕۆژنامەی کەیهانی ئێران وروتی" کاری من تەمام شود" واتە " کاری من تەواو بوو"(٦٢). هەر لەو دیدارە ڕۆژنامەیەدا باسی لە کۆتایی هاتنی مەئموریەتی خۆی کرد، ئەم دیدارە پێمان دەڵێت ئەو وەك کارەکتەرێك مەئموریەتێکی لەسەر شان بوە ئەو مەئموریەتیە کۆتای هاتوە ئەویش کۆتایی بەکارەکانی خۆی هێناوە. گەر لەسەرتادا پەلاماری کارگەی نەوت روینەدایەو پێش ڕێکەوتنەکە بارزانی بە حوکمی ئەوەیی مەئموریەتی شایی دەرکرد پرسو رایی بەشا بکردایەو پشتگیری کردنی سۆڤیەتیەکان و ئیسرائیل توشی غروری نەکردایە ڕێکەوتنی یانزەی ئازار نەدەبویە بنەمایەك بۆکۆتایی هێنانی بەرهەڵستکاریەکەی دژ بە عێراق، پێش ئەم هەلأنەش کاتێك بەعسیەکان کۆدیتایان کرد ئەم ڕاستەوخۆ لای خۆیەوە وەك پاڵپشتیەك بۆیان شەری رانەگرتایە رەنگ بوو ترسێك لای بەعسیەکان دروست بوایەو ئەو کۆدیتایەیان سەری نەگرتایە، خوێندنەوە لاوازەکانی سەرکردایەتی ئەوکاتی حزب بۆ روداوەکانی ناوخۆ و دەرەوەی وایکرد بوو نەیان زانیوە چۆن مامەڵە لەگەڵ ناوخۆی عێراق بکەن، نەیان زانیوە هەر هێزێك بە کۆدیتا هاتە سەردەسەڵات ئەو هێزە هێزێکی سەربازی دەبێت و

لەئایندەی ئەو هێزەدا حکومەتێکی دیموکراتی و کراوە دروست نابێت بەڵکو ستەمێك دروست دەبێت کە رێگرە لە خەونی کورد، لەهەموشی کێشە تر لەسەر دەمی شکستەکەدا بارزانی بیری لەتۆڵە سەندنەوە کردوەتەوە لەنەیارەکانی خۆی هەر لەوکاتەی شۆرش هەرەس دێنێت خانەوادەی مێرگە سوریەکان قەتلو عام دەکات و هەوڵی ئەوەدەدات لەگەڵ برادۆستیەکان گورزێك بوەشێنیت، لەسەردەمی قەڵەم رەوی خۆشیدا لەبری ئەوەی حزب ببێتە چەترێك بۆ کۆکردنەوەی خێڵەکان بارزانی حزبی کردە گورزێك بۆ تۆڵەسەرندنەوەی رابردو، ئەگەر زێباریەکان و برادۆستیەکان و هەرکیەکان و لەکەکان بەشێك بونایە لە هێزی ئەیلول ئەکرا لەناوچەکانی تری کوردستان ئەو هێزە بالأدەست بێت و توانای فشارەکانی زیاتر بێت، بەلأم ناکۆکی کۆنی نێوان خێڵی بارزان و ئەو خێلأنە کۆتای نەهات و لەو سەردەمەدا پەرەی سەند و ئەو خیلأنەش بونە چاوێکی ساغی حکومەتەکانی عێراق و شەریان لەگەڵ بارزانی دەستی پێکرد.هەمووشتێك لەپێناوی بالأدەستی خۆدا لە هەنگاوەکانی بارزانی و سەرکردە سەربازیەکانی ئەیلولدا بەدی دەکرێت، وەختێکیش هەڵەکان رودەدەن و مێژووی ئەوکاتانە دەنوسرێتەوە جگە لەسەرکەوتن شتێکی دی نانوسرێتەوە،

سەرکەوتنەکانیش ئەوەندە گەورە نین ئێستای ئەم سەردەمە بیانکاتە شانازی، ئەوەی لەسەرکەوتنی ئەیلول بەجێماوە تەنها بەیانی ١١ ئازارە، ئەوبەیانەی کە هەرگیز کاری پێنەکراو خرایە پەراوێزەوە، بەشە جێماوەکەی تری ئەیلول ئەوکارەساتە گەورانەن بونە برینی مەزن لە ناخی ئینسانی کورداو ئەم دۆخە ناتەندروستەیان پێکهێنا پاش راپەرین.

کاتیکێش بارزانی شکستی هێناو خۆی گواستەوە بۆ ئۆردوگاکانی ئێران و بریاری کۆتای هێنانی دا ئیدی ئەو خێڵانە بونە هێزی حکومەتی عێراق و سەرکەوتنیان بەسەر بارزانیدا هێندەی دی هێزەکانیانی فراوان کرد. کەنەوەی تازەش دەستیان کردەوە بەخەبات دژی حکومەتی عێراق بارزانی و حزبەکەی لەبری ئەوەی ببنە دینەمۆیەك بۆ ئەم شۆرشە نوێیە داوایان لە ئێران کرد هاوکاریان بکات تاکو جگە لەخۆیان لە ناو گۆرەپانی سیاسی کوردستاندا رێگە نەدەن کەسی تر خەبات بکات، بەپشت بەستن بە ئێران چەندین هێرشیان کردە سەر شۆرشە نوێیەکەو هەمان قەوانی سالآنی شەست دوبارە بویەوەو جارێکی دی شەری کورد کوشتن هاتەوە ناو گۆرەپانی سیاسی کوردستان و ئەوەی ئەو شەرەشی دروست کرد هەر ئەوان بوون،

لەگەڵ روخاندنی شادا و گواستنەوەی دەسەڵات و چونەوەی هێزە کوردیەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان جارێکی تر پارتی و نەوەکانی بارزانی بەپاڵپشتی ئێران و حکومەتە نوێیەکە شەریان لەگەڵ ئەو هێزە کوردیانە بەرپا کردو لەشارەکانی ئێران وەدەریان نان و بونە هۆی کوشتنی دەیان گەنجی کورد لە شارەکانی ئێران، ئەم مەئموریەتیەشیان بۆئەوە کرد لە ئێران رێگەیان بێتەوەو رێزیان لێبگیرێت و باکیان لەوە نەبوو شەری ئەوان بۆ ئێران دەبێتە هۆی کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی کوردی لە شارەکانی ئێران، کاتێکیش کوردەکان لە ئێران شکستیان هێنا نەوەکانی بارزانی و حزبەکەیان ئەمەیان بەدەستکەوێتکێکی گەورەی خۆیان زانی و بونە مەئموری حکومەتی ئێران تاکو راپەرینەکەی کوردان لە ساڵی ١٩٩١ لە باشور و لەگەڵ هاتنەوەشیان بۆ باشوور ئیدی جارێکی دی شەرێکی کۆنیان لەشاخەکانەوە گواستەوە بۆناو شارەکان. مەئموریەتی ئەو حزبە بۆ ئێران مێژوویەکی درێژی هەیە، لەسەردەمی روخانی شادا لەگەڵ ئێرانیەکان شەری حزبی دیموکرات و حزبە خەبات گێرەکانی تری رۆژهەڵاتیان کرد تا لەشارە ئازادکراوەکان وەدەریان نێن، گەر ئەوکاتە پاڵپشتی ئێرانیان نەکردایە چاوەرێدەکرا ئەو هێزانەی کورد لە ناوچەی رۆژهەڵاتی

کوردستان ئۆتۆنۆمیەك بەدەست بهێنن و دەرگایەکی بەهێز بکەنەوە بەڕوی کوردا، بەڵام لەبەر خۆیان ئەم دەرگایەشیان داخستو شکستیان بە هێزە کوردیەکان هێنا.

مەئموریەتەکەی پارتی و بارزانی لەسەردەمی ئەیلولدا کۆتایی هات، بەڵام لەسەردەمی نوێدا کۆتای نەهات و هەمان وەزیفە دوربارە بویەوە، ئەو دەستکەوتانەش کە ئێستە قسەیان لەسەردەکرێت لەبارەی بەیانی یانزەی ئازارەوە هەمان ئەو دەستکەوتانەن بەبێ شەرو ماڵ وێرانەی لەسەردەمی قاسمدا بەدی هاتبوون و مامەڵەیەکی سیاسی تەندروستیان لەگەڵ نەکرا، لەوەش گرنتگر قاسم نەتەوەی کوردی خستە ناو دەستورەوە بەڵام لەبەیانی یانزەی ئازار کەبەیانێکی سیاسی بوو لەنێوان دوو گروپ ئەو دەستکەوتانە نەکەوتە ناو هیچ یاسا و دەستورێکی عێراقی ئەوکاتە، تەمەنی ئەم رێکەوتنەش ئەوەندە کەم بوو کە عێراق بەهێز بوو ئیدی هەموو خەونەکان قوڵپ بونەوە بەزەرەری کورد کۆتایی هات، لەمەوە بۆمان دەرەکەوێت کە سیاسەتی کورت بین دەستکەوتی کورتیش لەگەڵ خۆی دەهێنێت. ئەوەی لە ئێستەشدا بەدەست هاتوە لەهەرێمی کوردستان بەرهەمی ئەو جۆرە سیاسەتە نیە بناغەکەی لە

ئەیلولدایە بەڵکو بەرهەمی ئەو ئاڵو گۆڕە سیاسیەیە لەناوچەکەدا رویدا، ئەگینا هەرگیز حزبی کوردی هێزێکی نەبوە بتوانێت بەرگری لە کۆی گشتی میلەت بکات بەڵکو تەنها هێزێکی هەبوە بتوانێت بەرگری لەحزب و خۆی بکات و ئەویش لەزۆر شوێندا ئەم هێزە ئەو بەرگری کردنەشی پێنەکراوە. ڕاپەرینەکەی باشوریش نەخشەی پارتی نەبوە، سێ خاڵی گرنگ وایانکرد ئەم راپەرینە روبدات، خاڵی یەکەم هەنگاوە هەڵەکانی رژێمی عێراق و مەترسی ئەو هەنگاوانە بۆ بەرژەوەندیەکانی ئەمریکاو بەریتانیا یەکێك بوو لەزەمینە سازیەکان، دووهەم نەخشەی راپەرینی یەکێتی کە عەقڵی پشت نەخشەکە خودی نەوشیروان مستەفا بوە، سێهەم هاوکاری کردنی هێزە چەکدارەکانی عێراق" جاش" ەکان بۆ ئەو راپرەینەو دەرکەوتنی خەڵك بۆسەر شەقامەکان، ئەم سێ خاڵە بنەرەتی سەرهەڵدانی راپەرین و کۆتایان بەدەسەلاتی بەعس هێنا، دینەمۆی ئەم نەخشەیەش یەکێتی و نەوشیروان مستەفا بوون، هەرچۆن لەسەردەمی ئەیلولدا خێڵەکان و بریارێکی چاکسازی دەبنە دینەمۆی سەرهەڵدانەکەو پاشان پارتی وەك حزب دێتە سەرخوانەکە، لەراپەرینی باشوریشیدا بەهەمان فۆرمی جارانەوە وەك میوانێك

هاتوته سەرخوانەکەو کاتێکیش هاتوە کۆتایی گەمەکەی بینیوەو فەرمان ڕەوایانە هەڵسوکەوتی کردوە.

# تابلۆکە یەك ڕەنگە

زۆر جار شەوێنەکان بیرکردنەوە ناگۆڕن، بیرکردنەوەکان شوێنەکان دەگۆڕن، هەمیشە پارتی وەك حزب لە رابردوو ئێستادا بەم لۆژیکە بیری کردوەتەوە(٦٣).نەیتوانیوە ئاراستەی شوێن بکات، بەڵکو خۆی بەپێی شوێنەکە ئاراستەکراوە، کاتێك لەئێران بوەو پاش ئاش بەتاڵ سەرکردایەتی خۆی بردوەتە ناو خاکی ئەو وڵاتەوە ئیتر بەپێی شوێنەکە لەلایەن دەسەڵاتی ئەو شوێنەوە ئاراستەکراوە، کاتێکیش هاتوەتەوە ناوکوردستان بەلۆژیکی ئەو شوێنەی کە دەستی دراوسێکانی تێدا باڵادەستە هەڵسوکەوتی کردوە، ئەو گوتارەی کە ئێستە بارزانی کوڕ پشتگیری لێدەکات، هەمان ئەو گوتارەیە خێڵەکۆنەکان تەحقیقی دەکەن، باوەڕ بوون بە کۆڵەکە کلاسیکیەکانی کۆمەڵگە، باوەڕبوونە بەو بنەمایانەی دەسەڵاتی خێڵ بەهێز دەکات، هەر هێزێك بیەوێت لەسەر مانەوەی خۆی بەردەوام بێت لە لوتکەی دەسەڵاتدا، هەمیشە ئەو هێزە کار بۆئەوە دەکات ئیش لەسەر خانە گشتیەکانی کۆی گشتی کۆمەڵگە بکات، ئەگەر ئەو کۆمەڵگەیە مەیلی بۆ بنەما کۆنەکان بوو، دەسەڵات دەبێتە چاپی بڵاوکردنەوەی ئەو فۆرمە، بەدیوەکەی تردا گەر کۆمەڵگە ویستی

دەرگاکانی بەرەو مەدەنیت بکاتەوە دەسەلأت هەوڵی ئەوەدەدات ببێتە کلیلی ئەو دەرگایە، ئەمەش تەنها لەبەرخاتری مانەوەی خۆیەتی، کاری ئەم جۆرە حزبانەش پێمان دەڵێت هێشتا حزب لێرە لەسەر فۆرمە ستالینیەکە دەروات بەرێوە(٦٤) بەلأم چوونگە کۆمەڵگەی کورد هێشتا لەسەر پایە کۆنەکان خۆی تەحقیق ئەکات دەسەلأتیش ئیش لەسەر ئەو پایانە دەکات ، ئیشکردنەکەش لەو سیاقەدا دەمێنێتەوە کە مانایەك بەمانەوەی دەسەلأت بدات، ئەگەر پێچەوانەکەی دەرکەوت و بویە ترس بۆلەقاندنی دەسەلأت، ئیدی دەسەلأت و کارەکتەرەکانی دەبنە دژی ئەو بنەمایانە، بۆئێمەی کورد هێشتا ناکۆکیەك نابینرێت لەنێوان دەسەلأت و بنەما کۆنەکان، بۆیە هەمیشە بەرگریکاری سەختی ئەو بنەما کۆنانە خودی دەسەلأت دەبێت، لەبەر هیچ نا لەبەر ئەوەی ئەو هێزانەی لەسەر میراسی ئەو بنەمایانە دەژین تا ئەم حاڵەتەش پێویستیان پێیەتی و دەبێت بەرگری لێبکەن، بارزانی و حزبەکەی یەکێکن لەو گروپانەی بەبێ ئەو بنەمایانە کاڵ دەبنەوە، چونکە ئەسڵی بوونی ئەوان لەسەر ئەو پایانە وەستاوە، دەشزانن هاتنی دیموکراسیەت واتە شکانی ئەو کۆڵەکانە، بۆیە گەر ببنە پارێزەری ئەو بنەمایانە مانای ئەوەنیە باوەریان بە ماهیەتی بنەماکان بێت وەك خۆی، بەڵکو دیوەکەی

تری راستە، بەبێ ئەو بنەمایانە بوونی ئەوان لەشوێنە گرنگەکان دەکەوێتە مەترسیەوە، بۆئەوەی ئەو شوێنە لەمەترسی بپارێزرێت پێویستی بەمانەوەی ئەو بنەمایانە هەیە. هەر رێگریەکیش بکرێت لەلایەن بارزانی و حزبەکەیەوە دژی دیموکراسی، حەقێکی خۆیەتی، لەبەرئەوەی ئەو و حزبەکەی بە هاتنی دیموکراسی مانا راستەقینەکەی خۆی لەدەست دەدات و رەگووریشەکانی هەڵدە تەکێنێتەوە. حزب رمێکی تیژە لەبەردەم دیوارەکۆنەکەدا رێگرە لەبەردەم هەر شەپۆلێکی نوێدا کە روو لە کارەکتەری کوردی دەکات، حزب نەبوەتە دەرگایەك بەرووی ئەو جیهانە نوێیە بۆیە خۆی بەستوە بە دیوارەکۆنەکەوە تا بەر بەداڕمانی خۆی بگرێت، گەرچی هەمیشە قسەلەسەر ئەوەیە دیموکراسیەتی گوتاری یەکەمە لەحزبدا، وەلێ دیوکراسیەت وەك دروشم بوەتە دەروازەیەك بۆ پەلاماردانی خودی ئەو خەونەی ناوی دیموکراسیەتە(٦٥) بارزانی بەبێ ئاگایی کار بۆ خنکاندنی دیموکراسی ناکات، بەڵکو بەئاگایەکی زۆرەوە دەست دەخاتە قورگی ئەو چەمکەوە، چونکە لەوە تێگەشتوە دوژمنە راستەقینەکەی خێڵ و کوڵەکەکانی، دیموکراسیەتی راستەقینەیە. حزبەکەی ئەویش لەسەر ئەم پایە کلاسیکیانە گەشە دەکات بۆیە هەوڵی زیندو راگرتنی ئەو پایانە دەدات تاکو

گەشی حزبەکەی نەوەستێت و هەمیشە خەون بەوە ببینن بگەڕێنەوە بۆ کۆن و ئەیلولێکی دی دروست بکرێتەوە. ناشکرێت داوای کرانەوەی زۆر لە ئێستاو کۆنی ئەو حزبە بکرێت، بوونی ئەو رەگو ڕیشەکانی بەو شەپۆلە نوێیە وشك دەبن کە ڕولەناوچەکە دەکەن، گەر بەرەنگاری ئەو شەپۆلەش نەبێت ئەوە مانای وایە زەنگی مردنی خۆی دەکوتێت، هەر ئەم ترسەشە لەکرانەوە بەردەوام وادەکات ئەوانەی شانسی چونە سەرکردایەتی ئەو حزبەیان هەبێت ئەو بیرکردنەوانەن لە پێناوی پاراستنی محافزکاری و ترادسیۆنەکۆنەکان تێدەکۆشن، هەرکەسێکیش پێچەوانەی ئەو ترادسیۆنانە هەوڵبدات ئەوا راستەوخۆ دەخرێتە دەرەوەی حەوشەی حزب.

# کۆڵەکەکانی خێڵ

لەسەرەتای دروست بوونی حزبی کوردیەوە، حزب وەك بیرکەرەوەیەکی جیاواز نەهاتوەتە ناو ژیانی گشتیەوە، بەڵکو وەزیفەی حزب بەهێزکردنی خیڵ بوە، یان خێڵ دینەمۆی حزب بووە، بۆیە هەمیشە حزب وەك دیوارێك بوەتە پارێزەری دەسەلاتەکانی خێڵ لەناو حزبدا، ئەشکرێت بڵێین ئەوە خێڵە حزب دروست دەکات نەك بیرکەرەوەیەی دی لەدەرەوەی خێڵ، راستە سەرتا چەند خوێنەوارێك نەخشەی حزب دەکێشن، بەلاّم لەناوەندا ئەوخێونەوارانە خۆیان دەکەونە پەراوێزەوە و خێڵ دەبێتە ئاراستەکەریان(٦٦) ئەگەر لەدەرەوەی خێڵیش کار بۆدروستکردنی حزب کرابێت، دواجار ئەو حزبە خراوەتە خزمەتی خێڵەوە، نەك بوبێتە دەرگایەك بۆکاڵکردنەوەی خێڵ. سالأنی شەستەکان بۆئێمە سالأنی دروست بوونی جەنگەڵێکە بەفۆرمێکی حزبیەوە، ئەوکاتەی حزب لەو سەردەمەدا بویە دەمامك بۆ خێڵ ئیدی حزب وەزیفە راستەقینەکەی خۆی لەدەست دا، حزب نەبویە دەرگایەك بۆهوشیارکردنەوە، بەڵکو بویە دەوارێك بۆکۆکردنەوەی خێڵەکان و پرچەك کردنیان بۆبەرگریەك بەناوی گوتاری نەتەوەیی، گوتارە نەتەوەیەکەش لە

پێناو بەهێزکردنی خێڵ بوو نەك لەپێناو مافی نەتەوەیەك، بۆیە هەر خێڵ بریاری چارەنووسی نەتەوەی دا(٦٧). کۆی گشتی بازنەکانی دەوری حزب کۆی گشتی ئەو بیرکردنەوانەن لە دیوەخانەوە بالأنس وەردەگرن، دیوەخان یەکەمین قوتابخانەی حزبەو دواهەمین دەسەڵاتی بالأشە، لەدەرەوەی ئەم فەزایە هەر جموجوڵێك دەبێتە جێگەی گومان و پەراوێزخستنەوە.

هەر لەو کاتەدا ماهیەتی حزب دابەشکردنی دەسەڵات بوو لەبنەماڵە گەورەکانەوە بۆ بنەماڵە بچوکەکان، وەستانی حزب لەسەر پایەی " خێڵ، پیرۆزی، نەتەوە" سێ لەو پایانەن لەناو ئایندا مانایان پێدەدرێت، بۆنمونە ئەو کاتەی حزب بریار دەدات یەکێتی ئافرەتان دامەزرێنێت وەك رێکخراوێکی حزبی، لەهەمان کاتیشدا بریار دەدات یەکێتی زانایانی ئاینی دامەزرێنێت(٦٨)، مامەڵەکردنی حزب لەگەڵ ئافرەتێکی چالاکوان و مەلایەك، یەك جۆر مامەڵەیە، بەلأم لە دوو شوێنی جیادا، کاتێك مەلاکان کەخوێنەوارەکانی ئەو سەردەمەن قبوڵ دەکەن وەك رێکخراوێکی حزبی بچنە ناو هەیکەلەی حزبەوە، ئازارێك بەر ئیمانی راستەقینە دەکەوێت، چونکە یەکێتی زانایان و یەکێتی ئافرەتان بۆحزب یەك مانای و یەك وەزیفەی هەیە،

بەڵام ئەرکەکان جیان، بۆیە هەمیشە حزب هەوڵی داوە سەرنجی مەلاکان بۆخۆی راکێشێت، چونکە گوتاری مەلاکان گوتارێکە ئەو حزبە بەهێزدەکات کەخۆی لەسەر کۆڵەکەکانی ئەوان بنیات ناوە، موقەدەس بوون و پیرۆزی هەرلە بنەرەتەوە بەرهەمی ئاین بوەو پاشان لەساڵانی شەستەکانەوە ئەم کۆڵەکەیە دەگوازرێتەوە بۆناو حزبو بنەماڵەیەك و کارەکتەرەکانی ئەو بنەماڵەیە پیرۆز دەکات، ئەگەر بارزانی کوڕ لە ئێستەدا دەست لەو گوتارە هەڵگرێت مەلاکان دەیدەن، دەستی لە بەشێك لە ماهیەتی خۆی و حزبەکەی هەڵگرتووە، لەهەرشوینێکیش مەلایەك گوتارێك دەدات لەبارەی پیرۆزیەوە لەو شوێنەدا بارزانی و حزبەکەی بەهێزدەبن، بەبێ شکاندنی ئەو پیرۆزیانە قورسە حزبەکەی بارزانی کرانەوە بەخۆیەوە ببینێ، کاتێك لەم سەردەمەدا بارزانی لەسەر وشەی " ئازادی خێزان" یاسایەك دەگەرێنێتەوە بۆپەرلەمان، ئەم گەرانەوەیە لەخۆکردە نیە، بەڵکو باوەر بوونی بارزانیە بە بنەما کۆنەکان، بارزانی دەیەوێت دڵی مەلاکان راگرێت، بۆئەوەنا کە خۆشەویستی ئەون، بۆئەوەی ئەوان ببنە پارێزەری بنەماکانی ئەو و حزبەکەی. لەوەش تێگەشیتوە ئەوان چ وەك حزب چ وەك خێڵە لەسەر ئەو کۆڵەکە کۆنانەهاتون و لەسەر ئەو کۆڵەکە کۆنانەش دەژیت بۆیە دەبنە پارێزەری(٦٩). هەمان دیدی پێش

خۆی دوبارە دەکاتەوە، وەلیٚ لەرێگەی سەربازی و رێکخراوەیەوە نا، لەرێگەی دەسەلاَتە یاساییەکانەوە، ئەوەی پێشوتر میراتگرانی خێڵەکە ئەنجامیان داوە بۆپیرۆزگرتنی کەسێك یان تاقمێك بەهەمان شێوە ئێستە سەرۆکی حزب ئەنجامی دەداتەوە.

ناکرێت لەئێستەدا کۆمەڵگە داوا لەبارزانی بکات پشت لەو گوتارە کلاسیکیە بکات و بانگەشەی کرانەوە بکات بۆ کۆمەڵگەکەی، لەبەرئەوەی هەرکرانەوەیەك بەو مانایەیی رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و رۆژنامەئازادەکان و ئۆپۆزسیۆن دەیەوێت ترسێکە لەبەردەم ئایندەی کورسیەکەی بارزانی و نەوەکانی، ئەگەر لەسەردەمی دەسەلاَتی سەرۆکایەتی هەرێمیدا بارزانی نەبێتە بەرگریکاری ئەو بنەما کلاسیکانەی لەخێڵەوە دێنە ناو ژیانی شارەکان و ناو سیاسەت و دەسەلاَ ت و یاساکان، واتای ئەوەیە ئایندەی نەوەکانی خستوەتە مەترسیەوە، وەزیفەکەی بارزانی و وەزیفەی ئەو خێلاَنەی رێگرن لەبەردەم کرانەوەی کۆمەڵگە یەك وەزیفەیە لە دوو شوێنی جیادا، بارزانی دەیەوێت بەیاسا رێگری لە کرانەوەبکات، خێڵەکانی ناو حزبیش بە عادەت، رەگو ریشەی ئەم بنەمایانەش لەسەردەمی ئەیلولدا دەست پێدەکات، ئەوکاتەی مەکتەب

سیاسی حزب لەگەڵ بارزانی ناکۆکیان دەست پێدەکات، لەسەر ئەو بنەمایانە دەست پێدەکات، کە کۆمەڵێك لەسەرکرەکانی ئەوکاتە نایانەوێت حزب بکرێتە قوربانی خێڵ، بەلاَم بەهۆی هەڵەکانی رابردویانەوە ئیدی ئەو درەختەی خۆیان چاندبویان لەدەستیان رۆچووبوو، چونکە خێڵ و تورەبوونەکانی خێڵ بوو بەرگریکردنی دەست پێکرد و ناو نرا شۆرش، هەرخێڵ و کارەکتەرەکانیشی بوون توشی شکستیانکرد نەك سیاسیەکانی، زەحمەت بوو بۆ ئەو گروپە بتوانن ئەو هێزە بخەنەوە ژێر دەستی خۆیان بۆیە جیابوونەوەی لێدروست بوو.جیابوونەوەی مەکتەب سیاسی لەگەڵ بارزانی ، جیابوونەوەی حزب بوو لە خێڵ، بەلاَم کاتێك حزب شکستی هێنا لەبەردەم خێڵدا گوناهەکە تەنها لەئەستۆی مەکتەب سیاسیەکان نەبوو، بەڵکو کۆمەڵگە بەشێك بوو لەوگوناهە، لەبەر ئەوەی خۆی لەسەر بنەمای خێڵ پەروەردەکردبوو، پەروەردەی کۆمەڵگە پەروەردەیەکی خێڵەکی بوو نەیدەتوانی لەم بازنەیە بچێتە دەرەوە و خۆی بخاتە ژێر چاپی حزبەوە, بۆیە خێڵ هەم بوویە حزب هەم بویە دەسەلاَت و هەمیش بویە خاوەنی بڕیارەکان(٧٠). ئەمە بەرگریکردن نیە لە تایپی مەکتەب سیاسی ئەوکات، ئەمە دیوە راستەقینەکەی ئەوکاتی کۆمەڵگەیە کە بەردەوام بەشوێن ئەوکەسایەتیە

خێڵەکیانە کەوتوە لەناو دیوەخانەوە هاتونەتە ناو کایەیی سیاسی، مانای ئەوەش نیە ئەوانە کەسەخراپەکانن بەڵکو کێشەئەوەیە بەهەمان بیرکردنەوە بێیت و سیاسەت وەربگێڕیتە سەر ئەو دیدە کۆنە، شکستی حزب لەبەردەم ئەم کەسایەتیانە درێژەی دەبێت تا ئەم چرکە ساتەی کە ئێمەی تێدا دەژین، دروست بوونی شۆرشی نوێش نەیتوانیوە خۆی قوتار بکات لەدەست ئەو جۆرە بیرکردنەوانەوە بەردەوام هەیمەنەی خێڵ بەسەر حزبەوە دەرکەوتوە.

کاتێکیش کۆڵەکەمانی خێڵ پاییەی خۆیان لەناو حزب بەهێز کرد ئیدی سەرتاپای بەرگریەکە برایە بالأی خێل و زیندوبونەوەیەك لە ناو دەمارەکانی خێڵدا سەری هەڵدا، گەر ئەیلول بەشێك بێت لەبەرگریکردنی کورد، بەشێکی تری بریتیە لەکوشتنی کورد و وەستاندنی کورد بەسەر دنیای کراوەدا، بەشێکی باجی ئەو ناتەندروستیەی ئەوسا لە ئێستەدا دەدەین. بارزانی ناتوانیٚ لەگەلٚ وشەیەکی سیاسی و کۆمەلأیەتی نوێی وەك " دیموکراسیدا" دا بێت، چونکە گەروابکات لەرێگەی بنەماکانی خۆی و حزبەکەی لایداوە، بۆئەو رۆشنبیرو کۆمەڵگەی کراوە گرنگ نیە، بۆئەو ئەوگوتارە گرنگە کۆمەڵگە دەوەستێنێت

و دەیگەرێنیتەوە بۆ شوێنیکی تاریك، چونکە بوونی هۆشیاری گشتی لاوازی ئەو دەرەخات، گەرانەوەشمان بۆ شوێنە کۆنەکان، رەعیەت و رۆحی کۆیلە زۆردەکات، گەر رەعیەت و رۆحی کۆیلە زۆر بوون بارزانی بەهێزدەبێ، خێڵ و حزبی خێڵەکی بەبێ ئەم جۆرە مەخلوقانە مانای نامێنێت، لێرەدا کەمێك بگەرێینەوە دواوە لەوە تێدەگەین ئەیلول کەپایەی یەکەمی ئەو حزبەیە چ کارەساتێکی بەسەر ئەم کۆمەڵگەیە هێناوە، لەبری هوشیاری، خێڵی زیندو کردوەتەوە، لەبری ناساندنی خەڵك بەکتێب، چەك بوەتە بەرهەمی، لەبری لێك تێگەیشتن، شەر هاتوەتە شوێنی، یانی بەهەردیوێکدا تەماشایەکی وردی رابردوی ئەم هێزە بکەیت کە ئێستە لەژێر دروشمی دیموکراسیدا خەونە جەهەنەمیەکانی خۆی دەرەخات، کۆمەڵگە ئیفلیج دەکات.لەگەڵ ئەمەشدا ئەو هێزەی لەگەڵ بارزانی بوون هێزێکی بەرگریکەر نەبوون لەکورد بەقەت ئەوەی هیزێکی بەرگری کەر بوون لەسەرکردەیەکی خێڵەکەیان و وەك سۆفی خزمەتی ئەویان کردوە نەك وەك سەرکردەیەکی سیاسی و سەربازی(٧١). ئەو هێزە هێزی پاش هەنگاوەکانی بارزانی بوە، بارزانی لەهەر شوێنێك بوبێ ئەو هێزەش لەوێ بوە، ئەوەندەی ئەو هێزە وێڵ بوون بەشوێن

خەونەکانی بارزانیدا ئەوەندە وێڵ نەبوون بەشوێن خەونی نەتەوەدا، خەونی نەتەوەشیان لەناو خەونی بارزانیدا بینیوە.

بارزانی بەرگری کاری راستەقینەی ئەو بنەمایانەیە، نزیکترین دۆستی بارزانی ئەوانەن باوەڕیان بەو کۆڵەکە کلاسیکیانە هەیە نەك ئەوانەی داوای دنیاییەکی نوێدەکەن بۆ ئەم هەرێمە، بۆیە دەبینین بارزانی کوڕ ئیمزای یاسای خۆپیشاندان دەکات کە رێگری لە مافی خەڵکە، بەلام لەسەر وشەیەك کە کۆمەڵگە بەرەو کراوەیی دەبات یاسایەك دەگەرێنێتەوە بۆ ناو پەرلەمان، ئەم دوو نامەیەی بارزانی بەسن بۆئەوەی بڵێین بارزانی و ئەو خێلانەی بونەتە گردێك لەبەردەم کرانەوەدا یەك بیرکردنەوەو دوو شوێنە. ئەگەر بەچاپێکی دی سەیری ئەم دوانەیەیی بارزانی و خێلەکان بکەین،" هەڵبەتە خوێنەر دەبێت ئەوە بزانێت بارزانی لەگەڵ ئەوەی سەرۆکی حزبە سەرۆکی خێڵەکەی خۆیانە و ئەو وەزیفە خێڵەکیەی جیاوازیەکی نیە لەوەزیفە سیاسیەکەی و بەشێکی زۆری خێڵەکەی بازنەی یەکەمی وەزیفە سیاسیەکەیان بەدەستە(٧١)". رەنگە ناچار بین قسەلەسەر ئەوە بکەین، بەرگری کردنی تاقمە کلاسیکیەکان لە سرینەوەی " وشەیەك" لەناو یاسایەك تەنها بەرگریکردنێکی ئاینی بێت،

وەڵێ بارزانی کاتێك ئەم یاسایە رەد دەکاتەوە مەبەستی ئەوەنیە خزمەت بەو خەونەبکات هێزە ئاینیەکان دەیبینن، بەڵکو حزمەت بەو خەونەدەکات خۆی دەیبینێت، خەونەکەی بارزانیش ئەوەیە لەگەڵ عادەتەکان برۆ بۆئەوەی لەدەسەلاَت بمێنێتەوە، لەکاتێکدا سیاسی دەکرێت زۆر جار دوور لەعادەتەکان و دوور لەزۆرینە بیر لە چەمکی " مەنتیق " بکاتەوە، بەس بارزانی ئەوە ناکات، نەك هەر ئەمەناکات بەڵکو بەهەنگاوەکانیدا دەرەکەوێت خەونی کرانەوەی نیە بۆکۆمەڵگە، کاتێك دەڵێت " هەولێر دەکەینە دووبەی" ئەمە لەروی فۆرمەوە دەڵێت، ئەو ناتوانێت بڵێت " هەولێر دەکەینە پاریس" چونکە لەپاریس مرۆڤەکان ئازادن و ئازادی مرۆڤەکان گرنگترە لە چاککردنی شەقامێك، مافی مرۆڤەکان گرنگترە لەبەرزکردنەوەی باڵەخانەیەك، بەس بۆبارزانی شەقام و باڵەخانەکان مانای کرانەوەن، پێی وایە ئازادی و مافەکان بەستراون بەباشی و خراپی شەقامەکانەوە، بەلاَم ئەوە شەقام و باڵەخانەکان نین ئازادی بەدەست دەهێنن، یاساو کۆی سیستەمەکەیە ئەو فەزایە دروست دەکات، بۆیە بەرلەگەڕان بەشوێن شەقام و باڵەخانەکاندا گەڕان بەشوێن ئازادیەکاندا گرنگترە کە ئەمەش بۆ بارزانی نەنگیە، ناکرێت لەپشت ئەم پرۆژانەوە ماف لە ئینسان بسەنرێتەوە و هەرەشە بکرێت

لەئازادیەکان و بەناوی یاساوە کار بۆدروستکردنی دەسەڵاتێکی فاشی بکرێت، بێ ماناییە ئەوەیە شارەکان جوان بن و هەموو شتەکان لە ئینسان بسەنرێتەوە، سەر سام بوونی بارزانی بە " دوبەی" سەرسەما بوونی کەسێکە بە باڵەخانەو شەقامەکان، نەك بە ئازادی و مافی مرۆڤەکان، تازەترین نمونەشمان بۆئەم سەرسام بوونە، ئیمزاکردنی یاسای خۆپیشاندان بوو، ئیمزاکردنی ئەم یاسایە ئیمزاکردنی خنکانی دیموکراسی بوو، شەقامی کوردی زۆرینەی لەسەر ئەم ئیمزایە هەستایە سەرپێ، کەچی بارزانی گوێی نەگرت، و هیچ یەکێك لە دوو حزبەکەش ناکۆك نەبوون لەگەڵ ئەم ئیمزایەدا و پێشیان قورسە لەدژی ئەو ئیمزایە هەنگاوێك بنێن، چونکە شکۆی ئیمزاکە بەلای ئەوانەوە گرنگترە لە شکۆی دەنگی خەڵك، خێڵەکانیش لەسەر ئەم ماف کوشتنە قسەیەکیان نیە، بۆئەوانیش گرنگ نیە شەقامی کوردی کۆنترۆڵ بکرێت و نارەزایەتیەکان خەفەبکرێن، بۆئەوان گرنگ ئەوەیە دەسەلأت بەگوێیان بکات لەو شوێنەی ئازادی دەست بۆ ئەوان و باوەرەکەیان دەبات، سەیرکەن ئەم دوو تایپە چەند لەیەك نزیکن بۆ سەندنەوەی خەونەکانی ئەم کۆمەڵگەیە، یەکێیان لەرێی گوتارە ئاینیەکانیەوە دەیەوێت هەمیشە کۆمەڵگە ملکەچی ئەو وەعزانەبێت لە رێگەی زمانی ئەوە دێنە دەر،

یەکێکی دیشیان لەرێگەی دەسەڵاتەکانیەوە جارێکی دی کۆمەڵگە دەخاتەوە ژێر هەیمەنەی خۆی، لەو شوێنەشدا پەرچەکردارێك دەرهەق بەیەکێکیان رودەدات هەردوولا وەك تیمەیێك دژی ئەوەستنەوە، یان ئەگەر یەکێکیشیان دژی نەوەستێت بێدەنگی هەڵدەبژێریت.ئەوەی ئێستە بارزانی دەیکات سەردەمانی ئەیلولیش بارزانی باوکی ئەنجامی داوە، جیاوازیەك نادۆزیەوە لەنێوان ئەو دوو تایپەدا بەگۆرینی زەمەنەکانیشەوە(٧٢).

هیچ لەم دوانە ئازار نین بۆسەر ماف و دیموکراسی خەڵك لەم هەرێمە، چونکە هەردوولا لەماهیەتیاندا دژی ئەو چەمکانەن، ئەوەی ئازارە بۆسەر خەونەگەورەکە" دیموکراسی راستەقینە" ئەو هێزانەن لەم نێوانەدا بە بێدەنگی و شەرمنیەوە سەیری روداوەکان دەکەن و قسەیەکیان نیە، یان بڵێین بەجۆرێك شەرمن بوون ئیدی دەیانەوێت لەگەڵ ئەو بایەدا شەن بکەن کە رەزەکەیان ئەپارێزێت. مل ملانێکە ئێستە لەنێوان هێزەکاندا نیە بۆ یەکلایکردنەوەی ئەم چەمکانە، بەڵکو مل ملانێکە لەنێوان خەڵکێکی ئازادی خوازو لەشکرێك لە محافزکارە، ئەوەی سەرەرمی محافزکاریەکەیە لەدەسەڵاتدان و ئەوی دی لە ناو

خەڵکدایە، ئەوان لە دوو شوێنی گرنگدا دەسەڵاتیان هەیە، لەناو ئاین و لەناو خودی دەسەڵات خۆی، خێڵەکان و ئەو عەقڵەی کە خێڵ بەرهەم دەهێنێت بازنەی بچوك بچوك و گەورە گەورەن لەم دوو شوێنەدا، هەرگیز ئەم جۆرە دەسەڵاتانە نەدەتوانن مافی ئینسانەکان بەتەواوەتی بدەن، نە بەرگەی ئەو شەپۆلەدەگرن کە دیموکراسیەتی راستەقینە لەگەڵ خۆی دەیهێنیت، بۆیە دەبێت نیگەران نەبین لەوەی گەر پەرچەکرداری ئەوان هەر جۆرێك بێت، چونکە پەرچەکردارەکەیان باوەریانە نەك هەوڵێکی ئاسایی بێت، هەر هێزێکی سیاسی یان حزبێك پێچەوانەی ئەو چاپەوە کە جیهانی ئەمرۆی تەنیەوە هەنگاو بنێت، پەرچەکردارێکی دی دێتە ئاراوە، پەرچەکردارەکەش لە و تایپەیە کەنایەوێت بگەرێتەوە بۆئەوخەونانەی ماف و ئەرکەکان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خێڵ و بنەماکانی، ئەگەرچی هەوڵێکی زۆریش بدرێت لەرێگەی یاسا و هێزەکانەوە ئەم هەوڵە کپ بکرێت، بەڵام دواجار دەبێت ئەم هەرێمە بەرەو ئەو ئاقارە بچێت کەخەونی گەورە هەیە بۆ کرانەو دیموکراسیەتی راستەقینەو بەرهەم هێنانی کۆمەڵگەیەکی تەندروست دوور لە چاپە خێڵەکیەکە، تورەبونەکانی خەڵك و زیندو بوونەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی و هاتنە ئارای ئۆپۆزسیۆن و بەهێزی رۆژنامەئازادەکان، ئەوپەیامە

دەدەنە ئایندەی ئەم وڵاتە کەزۆر زەحمەتە جارێکی تر هیچ هێزێکی کۆنزەرڤاتیڤ بتوانێت ئاقاری ئەم شەپۆلە بگۆڕێت، ئەشێت ئەوانیش کاری خۆیان بکەن و هەوڵی خۆیان بدەن، وەلێ دواجار باکە بەو ئاقارەدا ناچێت بەرهەمەکەی ئەوان شەن بکات، کاتی ئەوەش نەماوە دەست بەکلاوەکانەوە بگرێت تا با نەیبات، بایەك لەئارادانیە بۆبردنی کلاوەکان، بەڵکو ترسی ئەوان لەکلاوەکان وادەکات زۆر شت بکەن بۆئەوەی چیدی کورسیەکان نەکەوێتە بەر رەحمەتی ئەو تورەبوونەوە، ئەگەر بەرزانیش بیەوێت خەونی ئەوە ببینێت جارێکی دی ئەم هەرێمە بگەرێتەوە بۆسەردەمی ئەیلول و لەم سەری نیشتیمانەوە بۆئەوسەری نیشتیمان بکەوێتە ژێربالەکانی ئەو، ئەم خەونە هی سەردەمێك بوو نەك هی ئەم سەردەمە، تاقە هێزێك بتوانێت ئەم هەرێمە بخاتە ژێربالی خۆی دیموکراسیەت و کرانەوەیە، چونکە نەوەیەك بەرێوەیە ئەستێرەکانی زۆر جیاوازن لە ئەستێرەی نەوەکانی پێش خۆی، رەنگە لە ئێستەدا ئەو هێزە کۆنزەرڤاتیڤە بتوانێت کەمێك لەهەنگاوەکانی ئەو نەوەیە بوەستێنێ، وەلێ دواجار دەبێت لەو ئاوازە بخوێنێن لەگەڵە خۆیدا هەموو ماناکان لەیەك جیائەکاتەوەو دەسەلاتەکان لەیەك جیائەکاتەوەو ئەرکەکانیش لەیەك جیائەکاتەوە، ئاینیش بەشێك نیە لەو

سیاسەتەی کەلەم هەرێمە بەرێدەکرێت، ئاین رۆحە، پەیوەندی مرۆڤ و خوایە، عەدالەتە بەدیوە پاکەکەی، نەك پردێك بێت بۆگەیشتن بەکورسی دەسەلاّت، باشترێکیشە بۆئەوەی لەخوداوە نزیك بین لەمەلاکان دور بکەوینەوە، نزیك بوونەوە لەمەلاکان و ئەو هێزانەی بەرگێکی سیاسیان کردوەتە بەر ئیمانی راستەقینە دروکەوتنەوەیە لەخودا، گەران بەشوێن خوادا لەناو مزگەوتەکانەوە دەست پێناکات لەناو رۆحی خۆمانەوە دەست پێدەکات، تەفسیرکردنی کرانەو دیموکراسیەت بە دژە ئاین یەکێکە لەو تەفسیرە حزبیانەی خزاوەتە ناو ئیمانی خەڵکەوە، دەبێت خەڵك لەوە تێبگات ئیمانداری راستەقینە ئەو کەسەنیە دژی کرانەوە ودیموکراسیە، بەڵکو ئەو مەخلوقە بێدەنگەیە کە رۆژانە لەهەرێمەکەیدا ناعەدالەتی دەبینێت و دەست و پەنجەی خۆشی لەگەڵ ئەو دەسەلاّتە نەرم دەکات کە بوەتە هۆی تێکشکانی هەموو بنەماکانی ژیان. ئەوکاتەی دەسەلاّتەکان لەیەك جیاکرانەوەو هەر شتەو خرایەوە شوێنی خۆی و حزب نەبوە دەرگایەك بۆژیان و ئاین گەراندرایەوە شوێنە راستەقینەکەی خۆی، ئەوکاتە مانایەك بۆژیان دەگەرێتەوە، بەلاّم ئەگەر بەم تەفسیرەی ئێستە رازی بین کە لەلایەن مەلاکان و بارزانیاوە بۆژیان دەکرێت، مانای وایە رازی بوین لەوەی دەست

لە ئیمانی راستەقینەی خۆمان هەڵگرین و گشت شتەکانمان بدەینە دەست ئەو هێزە کۆنزەر ڤاتیڤەی تەفسیری هەیە بۆهەموو شتێك، تەفسیرێك کەدەمانخاتە بەردەم تاریکیکەی راستەقینە.ئەم دەروازەیەی ئێستا و خوێندنەوەیە بۆئێستا دەمان بەستێتەوە بە خوێندنەوەی بۆ رابردوو، بۆیە گرنگە لامان رابردبو بناسین بۆئەوەی بزانین لە ئێستەدا چی رودەدات، تەماشا کردنێکی سەرتایی هەردوو زەمەن پێمان دەڵێت هێشتا شتەکان وەك یەکن و روداوەکان جیاوازیان تێدایە ئەگینا هەنگاوە سیاسی و خێڵەکیەکان هەمان خوێندنەوەیان هەیە بۆ ئەم کارانە.

# ناکۆکیەکانی ناو خێڵی بارزان

بارزانیەکان جگەلەوەی ناکۆکیان هەبوە لەگەڵ خێڵەکانی دەورەو بەری خۆیاندا، لەناو خودی خۆشیاندا ناکۆکی هەبوە و زۆر جار ئەو ناکۆکیانە گەیشتوە ئاستی یەکتر سرینەوە و لەگەڵ ئەوەی بارزانی لەدەسەلاّتی خێڵەوە دێتە ناو دەسەلاّتی سیاسی و حزبیەوە ئەو ناکۆکیانەش دەگوازرێنەوە بۆ ناو کایەی سیاسی، کاتی خۆی کەبارزانی لەسالأنی سەردەمی شێخ مەحمود رادەکات بۆسلێمانی بۆئەوە نایەتە سلێمانی یارمەتی هێزەکانی شێخ مەحمود بدات و هیچ کام لە شەرەکانی شێخ مەحمود نە ئەوی تێدابوە و نە پەیوەنیشی پێیەوە هەبوە، بەڵکو کتێبی رەچەڵەکی بارزانیەکان پێمان دەڵێت لەسەر میراسی شێخایەتی بارزانی یەکێك لەسۆفیە نادوارەکان دەکوژێت(٧٤). پاش شێخ عەبدولسەلام باس لەوە دەکرێت جێگرەوەیەی یەکێك لەسۆفیەکانی ئەو ناوچەیە دەبێت، لەسەرداوای خۆی ئەم پێشنیازەی کردوە و شێخ ئەحمەدی کوڕە گەورەشی بەمە رازی بوە، بەلاّم بارزانی و یەکێك لە خزمەکانی شەوێك ئەو سۆفیە دەکوژن و لەترسی شێخ ئەحمەد هەڵدێن بۆ سلێمانی، پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەم ناکۆکیە لەسلێمانی دەبێت و شێخ

ئەحمەدی بارزان کە براگەورەیەتی لێی تورە دەبێت ئیبراهیم ئەحمەد دەکەوێتە نێوانیان و ئاشتیان دەکاتەوە و شێخ ئەحمەد بارزانی ئەبورێت(٧٥). ئەم ناکۆکیانە بەردەوام دەبن پاشان لەگەڵ ئاشتبونەوەی ئیبراهیم ئەحمەد دەکەوێتە نێوان خێڵی بارزان و زێباریەکان و بەهۆی داواکردنی حمایل خان بۆبارزانی ئەو ناکۆکیەی نێوان هەردوو خێڵیش کەم دەکاتەوە(٧٦).ئیبراهیچم ئەحمەد تەنها پەیکی ئاشت بونەوەی نێوان شێخ ئەحمەد و بارزانی نەبوە، بەڵکو پەیکی نێوان بارزانیەکان و زێباریەکانیش بوە و هەرخۆشی وایکردوە خوێندەوارەکانی ئەو سەردەم رازی بکات بارزانی وەك سەرۆکی حزب قبولّ بکەن و پاشان لێشی جیاببێتەوە، لەگەل ئەوەی حمایل خان منداڵی دەبێت و شۆرشی ئەیلول دەست پێدەکاتەوە ناکۆکیە خێڵەکیەکان دەست پێدەکەنەوە لەناو خودی خێزانەکانی بارزانیدا ئەو ناکۆکیانە رودەدەن، لەهەمووشی گرنگتر سەرجەم نەوەکانی بارزانی نەیان توانیوە خوێندن تەوا بکەن و تەواو نەکردنی خوێندنیشیان پەیوەندی بە باری سیاسیەوە نەبوە هەمووشتێك بۆئەوان مەیسەر بوە بەلاّم بەهەر شێوەیك بێت ئەوکارەیان پێنەکراوە، لەکاتێکدا ئامۆزاکانیان کە

پێکەوە بوون و بەشدار بوون لەهەموو شەرەکاندا خوێندنیان تەوا کردوە.

کاتێك کورەکانی حمایل خان گەورە دەبن ئیدی کورەکانی دی بارزانی وردە وردە دەکەونە پەراوێزەوەو کاریگەری ژنە زێبارییەکەش لەسەر بارزانی دەبێتە هۆی ئەوەی کورەکانی دی فەرامۆش بکات و ناکۆکییەکە بتەقێتەوە سێ لەنەوەکانی بارزانی رو لە عێراق بکەنەوەو پاڵ بەحکومەتی عێراقەوە بدەن، چونی لوقمان و سابیر و عوبیدلاّ بۆ بەغداد فشاری بارزانی بوە لەسەریان و نیگەرانی ئەوان بوە لەهێنانە پێشەوەی کورەکانی ژنە زێبارییەوە(٧٧). تائەوکاتەی مناڵەکانی نەوەی زێبارییەکان گەورە نەبون بارزانی وەزیفەی بەکورەکانی دی جێبەجێکردوە بەلاّم لەگەڵ گەورە بوونی ئەواندا ئیدی وەزیفەکەی گواستوەتەوە بۆ نەوە تازەکانی، ئەمەش بەهۆی کاریگەری حمایل خانوە بوەو ئەم کاریگەرییەش نەوەکانی دی بارزانی نیگەران دەکات و ناکۆکی کورەکان دەست پێدەکات. زۆرێك باوەریان وایە پێشوتر دەسەلاّتێکی وا بەدەست بارزانی نەبوە تاکو بیبەخشێتە نەوەکانی ئەوە حزب بوو وایکرد لەبارزانی ئیدی دەسەلاّت بەسەر نەوەکانی ببەخشێت و ناکۆکی کەوتە نێوانیان، بەلاّم

ئەوەی راستیە بارزانی لە مێژووی نوێدا یەکەمین پەیکە کە خێڵ لەدیوەخانەوە دەهێنێتە دەرەوە فۆرمێکی سیاسی پێدەبەخشێت و ئەیخاتە سەرکورسی دەسەلات، لەگەڵ ئەوەی خودی خۆی ئاراستەی سیاسی و سەربارزی دەکرد بەلام شێخ ئەحمەد وەك " خودانی "(٧٨)، گەورە هەمیشە ئاراستەی بارزانی کردو، شێخ ئەحمەد یەکەمین شێخی بارزانیەکانە لەگەڵ کاری تەریقەتدا کاری سیاسی و سەربازی کردوەو بارزانیەکان بە _ خودان_ ناوی دەبەن، پاش شێخ ئەحمەدیش کاتێك ئیدی بارزانی ئاوارەی ئێران دەبێت شێخ عوسمانی و برای ئەو وەزیفەیە بەرێوە دەبات تاکاتی مردنی(٧٩). بە بۆچونی بەشێك لەبارزانیەکان بارزانی نیگەران بوە لەوەی شێخ عوسمانی برای بچێتە شوێنی شێخ ئەحمەد و شێخ ئەحمەدیش پاش خۆی هیچ وەسیەتێکی نەکردوە کە کێ جێگرەوەی بێت، بەلام بارزانی خۆی بەجێگرەوەی شێخ زانیوەو تا مردنیشی رێگەی نەداوە هیچ کام لە شێخەکان بچنە شوێنی، پاش مردنیشی وەرگرتنی پۆستی جێگری لە خێڵدا کێشەی تێدەکەوێت و شێخ مەحمەد خالیدی ئامۆزای بارزانی و خەزوری مەسعود بارزانی خۆی بە میراتگرەوەی ئەو پۆستە دەزانێت و لەلایەن مەسعود بارزانیەوە رێگری لێدەکرێت و ئەم رێگری لێگرتنەشی بویە هۆی ئەوەی

لەماڵەکەی خۆی لەبارزان لەسەر بریارێکی مەسعود بارزانی بایکۆت بکرێت و رێگە نەدەن کەس هاتوچۆی بکات تا کاتی مردنی. شێخ محەمەد خالید بەردەوام لەگەڵ بارزانی بوەو ئامۆزاشیەتی، تاکۆچی دوای کرد کەس جەسارەتی ئەوەی نەدەکرد باس لەسەرۆك خێڵی بکات بەشێوەیەکی گشتی، ئەو پێداگریەشی لەسەر ئەو پۆستە وای لێکرد لەلایەن زاواکەیەوە کە مەسعود بارزانیە بایکۆت بکرێت و رێگە نەدرێت هیچ کەسێك وەلائی سەرۆك خێڵی بۆدەربرِێت، کاتێکیش کەمرد ئیدی دیوەخانەکە چۆڵ بوو مەسعود بارزانی بویە سەرۆکی خێڵ.

چونەوەی کورەکانی بارزانی بۆ عێراق بارزانی نیگەران کردو کورەکانی ژنە زێباریەکەی دڵخۆشکرد کە گۆرەپانەکە بۆئەوان چۆڵ بوو، بەهۆی کاریگەری دایکی مەسعود بارزانیەوە لەسەر خودی بارزانی راستەوخۆ بارزانی داوای کرد پاش خۆی مەسعود بارزانی بکرێتە سەرۆکی حزب، ئیدی لەگەڵ بوونی ئەو بەسەرۆکی حزب بەتەواوەتی دڵی کورە هەڵهاتوەکان شکاو لەساڵانی هەشتاکاندا کاتێك پارتی لەرێگەی ناوچەی سیدەکانەوە سوپای ئێرانی هێنایە سەر عێراق، لەلایەن عێراقەوە پارتی ئاگادارکرایەوە گەر ئەو سوپایە نەکشێنەوە و

چاوساغی بکەن بۆ ئێرانیەکان سەرجەم بارزانیەکانی ناو عێراق ئەنفال دەکرێت، ئەمەش بویە دەرگایەك بۆ نەوەکانی ژنە زێباریەکە کۆتایی بە ناکۆکیەکان بهێنن، بۆیە سوپایان هێناو سەرجەم بارزانیەکان ئەنفالکران و زۆربەی خورشیدیەکانیش لەو ئەنفالکراوانە بوون(٨٠) هەڵبەتە خورشیدیەکان بەشێکی جیاکراوەی ئەو تەریقەتەن و لەسەردەمێکدا شێخ خورشید دەکوژرێت و بارزانیەکان تاکو ئێستەش بەتەواوەتی ناوێرن قسەلەسەر ئەو خورشیدە بکەن بەلاّم لایەنگرانی بەهەموو شێوەیەك جیاوازترن لە لایەنگرانی شێخەکانی دی بارزان تەنانەت جلوبەرگیشیان جیاوازە.

ناکۆکی ناو خێزانەکە بەردەوام دەبێت تاگەرانەوەیان بۆ کوردستان، لەگەڵ گەرانەوەشیان ئیدی لەبری گەورەکان نەوەکانیان ناکۆکیان دەست پێکرد، ئەوان هەمیشە لەناوخۆیاندا ناکۆکن بەلاّم بەعادەتی خێڵەکی مامەڵە لەگەڵ ئەم ناکۆکیە دەکەن و هەوڵدەدەن نەچێتە دەرەوە، بەلاّم لە ئێستادا هەرچۆن کاتی خۆی ناکۆکی هەبوە لەنێوان کورەکانیدا ئێستە لەنێوان نەوەکاندا هەیە و چۆن بارزانی پشتی کورەکەی خۆی گرت بۆ پەراوێزخستنی کورەکانی دی ئێستەش مەسعود بارزانی هەمان

کاری باوکی دەکات و لەپشتی کورەکەی خۆی وەستاوەو هەوڵی کاڵکردنەوەی برازاکەی خۆی دەدات، کە شێخ محەمەد خالیدیش کۆچی کرد ئیدی مەسعود بارزانی لەروی خێڵەکیەوە کێشەی نەماو بەسەرۆکی خێڵ و جێگرەوە دەست نیشانکراو دەسەڵاتەکانی لەناو حزب و لەناو خێڵدا یەکەمین دەسەڵاتن و لەسەر ئەم بنەمایە زەمینە ساز دەکات بۆ کورەکەی کە پاش خۆی هەمان ئەرك جێبەجێبکات. سێ کوڕە هەڵهاتوەکەی بارزانی لەعێراق پۆستی باڵایان وەرگرت، سەردەمانێ دەوڵەتی عێراق بەکاری هێناون بۆ لاوازکردنی باوکیان، پاش ئەوەی ئاڵوگۆڕە سیاسیەکان رویان داوەو ئیدی ئەرکێکیان نەماوە جێبەجێی بکەن بەهۆی هەنگاوێکی پارتی و ئیران بۆناوچە سنووریەکانی سیدەکان لە لایەن عێراقەوە لەگەڵ "٨" هەزار بارزانی دی ئەنفال کران و زۆرێك لەوانەش نەیارەکانی بارزانی بوون. دوای ئەنفالکردنی ئەوان ئیدی رکابەرەکانی مەسعود بارزانی لاواز بوون و بەشێك لەململانێکە کۆتای هات و هەڵگیرا بۆکاتێکی دی.

هیچکام لەحەوت خێڵەکەی ناوچەی بارزان ناتوانن نکۆڵی لەو دەسەڵاتەی بارزانی بکەن، هەڵبەتە سەرجەم ئەو حەوت خێڵە

کەلەناو چەی بارزاندان لەلاەین شێخەکانەوە سەرپەرشتی دەکرێن و ئەو خێڵەش بە خێڵی بەرۆژیەکان ناسراون، وشەی بارزانیش وشەیەکە هی ناوچەکەیە نەك هی تاقە خێڵێك و هەریەك لەئەندامانی ئەو حەوت خێڵە بۆیان هەیە بەبارزانی خۆیان بناسێن و ئەسڵی وشەی بارزانیش لە " بارز" ەوە هاتوەو بەمانای شوێنێکی دەرکەوتە، یەکەم بنیات نەری ئەم ناوچەیەش دوو چیرۆکی لەسەرە، یەکێك لەچیرۆکەکان باس لەوەدەکات لەناوچەی شەمزینان مەلایەك بەناوی " مەلا عەبدوڵا" ناکۆك دەبێت لەگەڵ شێخەکانی ئەو سنورە و دێتە ئەو ناوچەیەو لەسەفەرەکەی مەلاوانا خالیدی نەقشبەندی نەوەکانی ئەو مەلایە دەچنە سەر تەریقەتی نەقشبەندی و شێخایەتی لەو سنوورە دەست پێدەکات(٨١). چیرۆکێکی دی باس لەوەدەکات کە ئەمانە لە خێڵی زێباریەکان و بەهۆی ناکۆکیەوە دەچینە ئەو ناوچەیەو پاش تێپەرینی مەولانا دەچنە سەر تەریقەت(٨٢) .ئینکاری لەوە ناکرێت پێش سەفەرەکەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بۆ ناوچەی شەمزینان کە لە سنووری بارزانەوە تێپەریوە تەریقەت بوونی نەبوە، لەگەڵ چوونی ئەو بۆئەو شوێنە تەریقەتی نەقشبەندی دادەمەزرێنێت و نەوەکانی مەلاعەبدوڵا دەبنە سۆفی ئەو تەریقەتەو پاشان دەبنە شێخی تەریقەت.

بەلاّم جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان تەریقەتی بارزان و تەریقەتی نەقشبەندی لەناوچەکانی دیدا، لەخانەقای بارزانیەکان مەلا و فەقیّ بونی نیە بۆخوێندن لەسەر دیراساتی ئاینی، بەلّکو تەنها شێخ و سۆفی و هەوادارەکانی هەن، شێخیش لەبری ئەوەی کلاّسی خوێندن دروست بکات ئێواران دەچێتە ناو خانەقا و سۆفیەکانی و هەوادارانی دەوری دەدەن، سەردەمی شێخ ئەحمەد بۆتەریقەتی نەقشبەندی لەناو شێخەکانی بارزان بەسەردەمی زێرین دەزانرێت و شێخ ئەحمەد لەگەلّ وەزیفە خێلّەکیەکەی خۆی کاری سیاسی ئەنجام داوەو چەندین جار بوەتە هۆی رێکەوتن لەگەلّ دەولّەتەکان لەسەر کێشەکانی نێوان کورد و ئەو دەولّەتانە، لەگەلّ ئەوەشدا شێخ ئەحمەد دەستیکرد بە ریفۆرمی ئاینی و لەگەلّ بریارەکەی ئەو تاکو ئێستە هیچ بارزانیەك ناچێتە حەج و لەبری حەج کردن کاری خێلّەکەی ئەنجام دەدەن، ئەم ریفۆرمە ئاینیەی شێخ ئەحمەد پەیوەندی بەوە هەبوو لەبری ئەوەی سۆفیەکان وەلائیان بۆشوێنی تر بێت وا پەروەردەی کردون وەلائیان بۆ خودی خێلّ و تەریقەت هەبێت. شێخ ئەحمەد لەسەر فەرمانی خۆی لەکاتی فەرمان رەوایەتیدا بەشێك لە قورسایی ئاینی لەسەر شانی سۆفیەکان و

هەوادارەکان هەڵگرتوە، لەبری ئەوە ئەرکی کۆمەڵایەتی و خێڵەکی و سیاسی خستوەتە سەرشانیان.

ئەو ناکۆکیەی ئێستە لەنێوان نەوەی شێخەکاندا هەیە، شێخ عەبدولمسەوەر ئامۆزای بارزانی و کورەکانی بارزانیدا لە ململانێدان لەسەر بنەمای میراسی جێگرەوەو تاکو ئێستەش هیچ لایەکیان بۆئەوەی دی سەر نەوی ناکات، هەریەك لەم دوو نەوەیە کە ئامۆزاشن خۆی بە جێگرەوەی شێخ ئەحمەد پیشان دەدات، بەلاّم نەوەکانی بارزانی دەسەلاّتیان هەیەو شانسی زیاتریان هەیە بۆ ئەو شوێنەو بۆیە رکابەری شێخەکانی دی هیچ کاریگەری لەدەسەلاّتەکانی ئەوان ناکات لەدەرەوەی گوندی بارزان، وەنەبێت تەنها ناکۆکیەکان لەناو خودی خێزانەکەی بارزانی هەبێت لەسەر میراسی دەسەلاّت، بەڵکو لەناو خودی گوندەکەشیان ئەم دیاردەیە دەبینیرێت. ئەوەی ناکۆکیش دروست دەکات تەنها وەرگرتنی دەسەلاّتە لەلایەن هەریەك لەو جەمسەرانەوەی کە دژی جەمسەرەکەی دیە.گواستنەوەی ناکۆکیەکان لەسەرەوە بۆخوارەوە یەکێکە لەوخاڵانەی بەردەوام لەناو ماڵی شێخەکان دەبینرێت، لەو نێوانەشدا بەپێی کات و سەردەمەکە کوشتن و سرینەوە رویداوە، جاری واهەبوە لەسەر

میراتگرتنەوە خراپترین کردەوە دەرهەق بەیەکتری دەکەن، ئەم حاڵەتە چ لەناو ماڵە شێخەکان هەیە چ لەناو خودی نەوەکانی بارزانی کە ئێستە کوڕەکانیان ئەو کارانە دەکەن لەبری باوکەکان.

# دینەمۆی دروستکردنی رەعیەت

هەمیشە ئەو حزبانەی لەسەر بنەمایی یەکتر سرینەوە و بە رەعیەتکردنی ئاستی خوارەوە کار دەکەن لەبری کەسی بیرکەرەوە کەسی بیر کوژ بەرهەم دەهێنێت، یەکێك لەخاڵە زۆر مەترسیەکانی ئەیلول و پارتی هەرئەوەبوو توانی لەو جۆرە کادیرە دروست بکات لەسەر بنەمای بیر کوشتن بژیت، بۆیە پارتی بویە یەکەمین مەکینەی بەرهەم هێنانی ئەم جۆرە مرۆڤە لە مێژووی سیاسی و سەربازی ناوچەکەدا ، ئەگەر بەدیوە مەدەنیەکەی تەماشای بکەین رەچەڵەکەی فاشیەت لە ئەوروپا لەناو فیکردایە بەڵام لێرە لەناو خێڵ و حزبدا دەستی پێکرد(٨٣).ئەگەر فاشیەت مەکینەی کوشتن بەرهەم بهێنێت ئەوا خێڵ و حزب هەمان وەزیفە دوبارەدەکەنەوە بەفۆرمێکی دیەوە، کێشە گەورەکەی حزبی کوردیش هەر ئەوە بوو لەسەتاوە تاکو ئێستە لەسەر یەك تایپ دروست بوە ئەویش تایپە سۆڤیەتیەکەیەو هیچ کام لەو حزبەکان نەیان توانیوە ئەم فۆرمە تێپەرێن و دیوێکی تری حزب دەربخەن. فاشیەت و ستەمکاری و تۆتالیتاریزم سێ چەمکی فەلسەفین لەسەردەمی مۆدرێنەتەدا

زۆرترین قسەیان لەبارەوە کراوە، هەرسێ لەم سێ فکرە لەناو خودی حزبدا بونیان هەیە، لەگەڵ ئەم سێ چەمکەدا ببونی چەمکی دی ئامادەیان هەیە کە هێشتا خوێندنەوەیەکی قوڵیان بۆنەکراوە، بەخوێندنەوەیەکی وردی حزب وامان لێدەکات کۆی ئەو فیکرانە لەناو ماهیەتی حزبدا ببینین، و بگەینە ئەو ئاستەی بتوانین بڵێین پارتی وەك حزب تێکەڵەیەکە لەکۆی ئەم چەمکانە.

کاتی خۆی لە رۆژنامەو شوێنەکاندا کە ئەم قسانەمان دەکرد کەسانێك بەوە تەفسیریان دەکرد کە ئێمە کێشەیەکمان لەگەڵ خودی پارتی هەیە، راستیەکەشی ئەوە بوو ئێمە کێشەمان لەگەڵ ئەو عەقڵە بوو لەم تایپەی حزبەوە دەهاتە دەرو مەترسی بوو لەسەر ئایندەی ئازادیەکانی تاك، مەترسیەکەشی بەشێوەیەکی رون دەرکەوت، هەرچۆن لەرابردودا ئەو حزبە بویە هۆی خراپ داکوتنی کۆڵەکەکان لە ئایندەشدا دەبێتە دیوارێکی گەورە لەبەردەم خەونەئازادەکانی ئەم هەرێمە، ئەم دۆخە لەناو ئەو حزبەدا گوازرایەوە بۆ حزبەکانی دی هاوپەیمانی، بۆیە دەبینین یەکێتی پێش رێکەوتنەکەی لەگەڵ پارتی هێشتا تروسکایەکی تیامابوو بتوانێت جیاوازی لەخۆی بگرێت و بنەماڵەگەری نەکاتە پرۆژەی حزب، وەلێ پاش رێکەوتنەکەی

نێوان ئەو دوو حزبە ئیدی هەمان دیدگا بۆیەکێتیش دووبارەبوەوە، ئەوەی ئێستە لەناو ئەو دوو حزبەدا بەدیدەکرێت دوو بنەماڵە لەلوتکەدان و ئەوانی دی کە رۆبۆتە ئازیزەکانن ئەوکارانە دەکەن کە دووبنەماڵەکە دەیانەوێت، بۆیە لەیەك کاتدا دەکرێت تەفسیرێکی یەك ڕەنگی بۆهەردوو حزب بکرێت، چونکە یەکێتیەکەی جاران کاڵ بوییەوەو ئیدی بنەماڵەیەك بوونی هەیە نەك حزبێك، مەکتەب سیاسیش هەمان مەکتەب سیاسی پارتیەو لەغیابی عەقڵدا دەژین.گەر بیریش بکەنەوە بیرکردنەوەیان لەپێناوی دوو بنەماڵە نەك لەپێناوی خەڵك. باشترین رۆبۆتێکیش کەهەمیشە ئەم دووحزبەی پاراستوە و کێویێك بوە لەپشتیان سەرۆکایەتی حکومەت و پەرلەمان بووە، ئەم دووشێنە دوو شوێن بوون بۆ پاراستنی حزب و دوو رۆبۆتی گەورە بوون تاکو مەهامەکانی حزبە بگوازنەوە.

کاتێك حزبیش لەبری بیرکردنەوە رۆبۆتە سەربازیەکان و شێخە میلیشیاکان و خێڵەکانی کردە مەحەکی نێوان خۆی و خەڵك ئیدی هیچ مانایەك بۆ ئازادی و کەرامەتی ئینسان نامێنتەوە، ئەو هەنگاوانەی ئەمرۆ حزب دەیهاوێت هەمان ئەو هەنگاوانەن کەپارتی لەسالأنی شەستەکانەوە تاکو ئێستە دەیان هاوێت،

ئەشێ بوترێت حزب بۆخۆی بوەتە ڕۆبۆتێکی و پارتیش وەك بەرهەم هێنانی کادیری غائیب لەعەقڵ داهێنەرە. نەك هەر لەو تاییەدا داهێنەرە بەڵکو دینەمۆیەکی سەرەکی زیندوکردنەوەی خێڵەو ئیدی ئەوە خێڵە سیاسەت دەکات و وڵات بەڕێوە دەبات نەك هیچ هێزێکی دی، ئەگەر ورتر قسەبکەین و بگەڕێینەوە بۆمێژووی دروست بوونی حزب لەسەدەی بیستدا لەم مەملەکەتە، ئەتوانین بڵێین دروست بوونی حزب دروست بوونی ڕەعیەتە، چونکە لەشەستەکاندا و لەسەردەمی ئەو جەنگەڵەی ناوی ئەیلول بوو، پایەیەکی عەقڵ گەری بوونی نەبوە، هەمیشە حزب وەك کارخانەیەك ئینسانی کوردی ڕاهێناوە لەسەر چەتەگەری و لەسەرکوشتن و لەسەر وێرانکردنی هەموو ئەو پنتانەی کە مرۆڤ پەروەردە دەکەن بۆ ژیانێکی مەدەنی، حزب هەر نەك ئەمەی نەکرد بەڵکو هەڵسا ئەو خەیاڵانەشی کوشت کە کتێب بخەنە ناو سیاسەتەوە، بۆیە بەردەوام ئەو کەسانەی ئیهانەدەکرد نزیکن لەکتێبەوەبوون، ئەو پایە ناتەندروستانەی ئەیلول بویە هۆی دروست کردنی ئەم بەرپرسە گەندەڵانەو ئەم مەخلوقە میلیشیایانەی ئێستە کە لەپێناوی مانەوەی خۆیاندا دەست بۆهەموو خراپە کاریەك دەبن. دەبینین لەو سەردەمەدا بانگەشەی ئەوەکراوە سەرتاپای وڵات تفەنگ هەڵگرێت، بەڵام

هیچ لە پەیرەوەکانی حزب و هیچ لەبانگەوازەکانی حزب باس لەهەڵگرتنی دیدێکی دی ناکەن جیاواز بێت لە دیدی تفەنگ، گەر ئەو سەردەمە پێویستی بەتفەنگ بوبێت هێندەش پێویستی بە دیدەکانی دیش بوە بۆ ئاراستەکردنی کێشەکان.

ئەتوانین بە تێگەیشتن لە ئەیلول رێگە بەخۆمان بدەین بڵێیت، مۆدێلی حزبی کوردی جگە لەمۆدێلێك بۆکپ کردنەوەی ئینسان و دورخستنەوەی لەعەقڵ شتێکی دی نەبوە، شۆرش بریتینیە تەنها لەتفەنگەکان، شۆرش گواستنەوەی عەقڵە لەشارەکانەوە بۆشاخەکان، حزبی کوردی جگە لە " کۆمەڵەی رەنجدەران" هەرگیز نەیتوانیوە ئەوکارە بکات، بۆیە لەبری شۆرشگێر کادریی رۆبۆتی بەرهەم هێناوە، ئەم کادیرە دوور لەزانستانە کە کاریان دروشم بازی و بەدوژمن کردنی ئەویتر بوە یەکەم ماڵوێرانکەری شۆرش بوون، چونکە دووربوون لەبیرکردنەوەیەکی قوڵەوە خەباتەکەشیان کە بەناوی خەباتی ئازادی بوە جگەلە درۆیەك شتیکی دی نەبوە، ئەوان لەپێناوی حزبەکەیان باکیان بەکوشتنی ئینسانی کورد نەبوە، لەپێناوی بنەماڵەیەك کێشەیان نەبوە ولاتێك بکەنە جەنگەڵستان، ئەمکارانەی ئەوان کاری کەسی شۆرشگێر نیە کاری جەنگاوەری رەعیەتە، گەر ئێستەش

هەمان مۆدێلی شاخ دووبارەبکەنەوەو کار لەسەر هەنگاوەکانی رابردوو بکەن جێگەی نیگەرانی ئێمەنیە، چونکە پەروەردەکەیان لەسەر ئەو بنەمایە بوە. لێکترازانی ئەو دوو پەروەردەیە کردنەوەی دەرگایەکی دیە بەسەر فۆرمێکی تری حزبدا.

ئەوەی لەرابردودا پارتی کردی ئەمرۆ بەهەمان شێوە یەکێتی ئەنجامی دا، هەڵبەتە یەکێتی وەك تاڵەبانی و گروپە ستایشکەرەکەی، ئەمکارەش لەپێناو داوای پارتی بوە، دیارە هەنگاوەکانی تاڵەبانی لەرێگەی رۆبۆتە سەربازیەکانیەوە ئومێدێکە بۆ پارتی و بنەماڵەکان، چونکە ئەوەی پێویست بوو لەم ماوەیە پارتی بیکات ئەوەبوو یەکێتی توشی شەر بکات لەگەڵ خەڵکداو ئەو فشارەی لەسەر پارتی بوو کەمێك لاواز ببێت، تاڵەبانیش هەرئەوەی کرد کەبارزانی خەونی پێوەدەبینی، تەسلیمکردنی هێزێکی فرە رەنگی وەك یەکێتی و خستنە ژێردەستی ئەم هێزە لەلایەن تاڵەبانیەوە جگە لەزەنگێك بۆکوشتنی جیاوازیەکانی ئەو حزبە خوێندنەوەیەکی دی هەڵناگرێت، وەلێ بۆپارتی ئەمە ئومێدیکە کە لەگۆرەپانەکەدا ئیدی بەتەنیا نیە بۆسەرکوت کردن بەڵکو هێزێکی دیش لەگەڵیەتی، بۆیە هەرچۆن پێویستە رۆبۆتەکانی پارتی رزگاریان

بێت لەدەست بنەماڵەو حزبەکەیان ئاواش هێزە جیاوازەکانی یەکێتی پێویستە حزبەکەیان لەو رەعیەتە نوێیانە رزگاربکەن کە تاڵەبانی بۆی دروست کردوەو هەوڵ بدەن لەمە زیاتر یەکێتی نەبێتە پارتی و جیاوازیەك دروست بکەن بۆحزبەکەیان و ئەو عەقڵە میلیشیایەی یەکێتیش بکەنە دەرەوەی حزب کەبونەتە موسیبەتی گەورە بۆحزبەکەیان، تاقە چارەسەری یەکێتی لەم زەمەنەدا تەنها ئەوەیە جیاوازی دروست بکاتەوە لەناو خۆی و خۆی رزگار بکات لەو وێنەیەی پارتی بۆی دەنەخشێنت. بەستنەوەی ئێستا بەرابردوەوە کارێکی قورس نابێت بۆ کەسێکی خوێنەری ئەو سەردەمانە. لەبەر هیچ نا لەبەرئەوەی ئەوانەی فەرمان رەوای ئەم سەردەمەن هەمان ئەو کارەکتەرانەن لەسەردەمی ئەیلول فەرمان ڕەوا بوون، هەنگاوەکانی سەرتایان و هەنگاوەکانی ئێستەیان، جیاوازیەکی زۆری تێدانیە، تەنها ئەوە نەبێت زەمەن گۆڕاوە، بیرکردنەوەکان بەهەمان تایپی جارانەوە لە ئێستادا خۆی دەرەخات، ئەشێ لەکۆتایی ئەم هەوڵەدا بڵێین خوێندنەوەی ئێمە بۆ ئەو سەردەمە خوێندنەوەی هەموو روداو کارەسات و سەرکەوتنەکان نیە، بەڵکو وەرگرتنی چەند نمونەیەکە تاکو ئاستی سیاسی و پەیوەندیەکان و دیدی شۆرش و سەرهەڵدان و بالادەستی خێڵ لێك بدەینەوەو قسەی خۆمانی

لەسەر بکەین، ئەم دەرگایەش دەکەیەنە یەکەمین دەرگا تابتوانین لەئایندەدا خوێندنەوە بۆچەن وێستگەیەکی دی کورد بکەین و بەسەر روداوەکانی شۆرشی نوێیدا گوزەرێك بکەین. ئەگەر تەمەن مەودا بدات لەئایندەدا دەست دەکەین بە خوێندنەوەیەکی دی لەسەر سالأنی نویّ. ئومێدەکەین خوێنەران لەهەر کەمو کورتیەك بمان بوورن.

# سەرئەنجام

لەم کتێبەدا بانگەوازی ئەوەناکەین وەك مێژوو نوسێك خۆمان دەرخەین، یان وەك لێکۆڵەرەوەیەکی میژووی، بەڵکو لەدیدێکی رەخنەگریەوە چونەتە ناو سەردەمێك کەر هەرگیز خۆمان لەو سەردەما نەژیاوین، رەنگە زۆرێك واتێبگەین ئەمە ئیشی ئێمەنیە وەك رۆژنامەنوسێك، بەڵام هیچ رۆژنامەنوسێك ناتوانێت ببێتە رۆژنامەنوسێکی باش ئەگەر روداوەکانی بەرلەخۆی نەخوێنێتەوە ونەزانێ پێش خۆی چی رویداوە، ئەگەر کارەکەی ئێمە لێرەدا کارێکی خراپ بوبێت هەڵبەتە داوای لێبوردن لەخوێنەران دەکەین کەنەمان توانیوە هەقێکی تەواو بەو دیوەتاریکەی مێژوو بدەین، هەرلەسەرتاوە کەدەستم دایە ئەمکارە نەمەویست دیوە رۆناکەکەی دەرخەم، پێموابوو ئەوەندە کتێبی ستایشی و پیاهەڵدان لەسەر ئەو سەردەمە نوسراون پێویست ناکات کتێبێکی دی لەوجۆرەش دیسان بنوسرێتەوە، ئەوەی روناك بوو رۆژانە بلاْودەکرێتەوەو یەك ئیمپراتۆری راگەیاندن کارە لەسەر دیوە روناکەکەی دەکات، ئەوەشی کەوتبویە تاریکیەوە وەك خۆی مابویەوە و کەم کەم لێرەوە لەویَ کاری بۆکراوە، ئێمە چوینە ناو دیوە تاریکەکە، بەدێدێکی

ڕەخنەی تەماشای هەوڵ و ڕوداوەکانمان کرد، هیچ هەوڵمان نەداوە ڕوداوەکان بشێوێنین، سەرچاوەکانی بەردەستمان چیان وتوە وەك خۆی دامان ناوەتەوە بەئاماژەو تێبینیەکانی خۆمانەوە، ئەشێ بڵێین تەنها خوێندنەوەو کۆکردنەوەی سەرچاوەکان بناغەی یەکەمی ئەم کتێبەن، پارتیەکان و لایەنگرەکانی ئەو حزبە دوای بڵاو بونەوەی کتێبەکە چی دەڵێن بابیڵێن، بۆمن گرنگ نیە چەند خوێندنەوەی ناتەندروستی بۆدەکرێت، بۆمن گرنگ بوو دەست بخەمە سەر خاڵەڕەشەکان و ئەودیی ڕوداوەکان بخوێنمەوەو پاڵەوانە سەرەکیەکانی بەجۆرێك لەجۆرەکان بناسێنم بەنەوەی نوێ.

**سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

(١) ئەم وتەیەی هی " بەختیار عەلی یە لە نووسینیک لە گۆڤاری رەهەند، قسەکردن لەبارەی ئەنفال و بەعسەوە. بەختیار عەلی لەم لێکۆڵینەوەیدا هەوڵدەدات خوێندنەوەیەکی دی بۆ بەعس و ئنفال بکرێت، ئەم فایلەی رەهەند لەسەر ئەو کارەساتە یەکەمین هەوڵی فیکریە لە ناو کوردا کە بۆ ئەنفال و بەعس کرابێت.

(٢) ژیان نامەی عەبدولکەریم قاسم .

(٣) زراری سلێمان بەگ: زراری سلێمان بەگ یەکێکە لەوانەی چوەتە روسیا و باس لەوەدەکات لەم گەرانەوەیەدا زۆربەی عێراقیەکان لەشاری بەسرەو بەغداد پێشوازیان لێکردون ئەمەش پاڵپشتیەکی حکومەت بوو بۆ ئەوکاتەی کورد. ئەم کتێبەی زراری سلێمان بەگ، بەهۆی وتنی چەند راستیەکەوە لەسنووری پارتی قەدەغەکرا و سەردەمی دەرچونی کتێبەکەش هەلأیەکی زۆری نایەوە.

(٤) خوێنەر بۆ دڵنیابوون لەو رێگری نەکردنەی دەسەلأتەکەی قاسم دەتوانێت بگەرێتەوە بۆ

چالاکیەکانی پارتی لەشارەکانی عێراق لەو سەردەمەو بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی ڕەسمی پارتی بەزمانی کوردی و لەچاپدانی لە شاری بەغداد. هیچ کام لەو چالاکیانەش تاچونی بارزانی بۆ سۆڤیەت بەهۆی یادی سەرکەوتنیانەوە نەوەستاون، لەگەڵ گەرانەوەی بۆ بەغداد ئەو چالاکیانەوە وەستێنران.

(٥) بەیان نامەی حزبی شویعی ئەو کاتە لەرۆژنامەکەیان باس لەوە دەکات بارزانی و قاسم پێکەوە کاریان کردوە بۆ سەرکوتکردنی حزبی شویعی. لەگۆڤار و رۆژنامەکانی ئەوکاتی خۆیان کێشەکانی نێوان حزب و بارزانی و قاسمیش باس کراوە.

(٦) نەوشیروان مستەفا، لەزنجیرە کتێبەکەی خۆی خولانەوە بەدەوری بازنەکاندا باس لە دواهەمین کۆبونەوەو دواهەمین بریاری ئەو حزبەدەکات و خوێنەر دەتوانێت بگەرێتەوە بۆ ئەو کتێبانە. کتێبەکانی نەوشیروان مستەفا سێ لەو کتێبانەن لە شۆرشی نوێدا بە شێوەیەکی رەخنەی نوسراون و تا ئێستەش پارتی ئەو سێکتێبە بە سێ کتێبی دژ بەخۆی تەماشادەکات.

(٧) ئەو پرۆژە یاسایە زەوی کوشتوکاڵی لەدەست ئاغاکان وەردەگرتوەو دەیدایە جوتیارەکان، ئەمەش نەنگێ بوو بۆسەرۆک خێلەکان و ئەمەیان کردە بیانوێك کە گوایە قاسم دژی کوردەو دەستیان کردە شەرکردن لەگەڵ قاسمدا، لەکاتێکدا پرۆژەکە بۆسەر جەم زەویەکانی عێراق بوو نەك کوردستان. پاش ئەوەی کێشەی نایەوە پرۆژەکە جێبەجێکرا و تەنها جێبەجێکردنەکەی کوردستانی نەگرتوە.

(٨) دیداری قانیعی فەرد لەگەڵ عیسا پژمان رۆژنامەی کەیهانی ئێرانی.

(٩) عیسا پژمان دیدار. رۆژنامەی کەیهانی ئێران. خوێنەری بەریز عیسا پژمان ساواکی ئێرانی بوەو بەمەبەستی کاری سیخوری کردن هاتوەتە عێراق و لەگەڵ کوردەکان رێکەوتوە بۆئەوەی دژی دەسەلاتی قاسم راپەرن. لەو هاتوچۆیانەی خۆیدا چاوی بە ئیبراهیم ئەحمەد و تاڵەبانی و بارزانی کەوتوە هەرخۆشی یارمەتیەکانی داوەتە دەستیان.

(١٠) مەسعود بارزانی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد.

(١١) کتێبەکەی مەسعود بارزانی بەرگی سێهەم بەشی یەکەم فەسڵی یەکەم.

(١٢) هەمان سەرچاوی پێشوو.

(١٣) دیدارێکی ئیبراهیم ئەحمەد بە تیڤی ، پێش کۆچی دوای لە بەریتانیا. ئیبراهیم ئەحمەد هیچ کتێبێکی نیە لەسەر ئەو سەردەمە بلاو بوبێتەوە جگە لەو چەند چاوپێکەوتنەی کە لەرێگەی رۆژنامەنووسانەوە ئەنجام دراوە.

(١٤) کتێبەکەی مەسعود بارزانی بەرگی سێهەم.

(١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(١٦) کتێبەکەی قانیعی فەرد لەبارەی ئەیلول و ساواکەوە، و بیرەوەریەکانی تاڵەبانی. ئەم کتێبە کێشەی گەورەی لەنێوان پارتی و یەکێتی دروست کرد و یەکێکە لەو کتێبانەش کە زۆرترین راستی تێدایەوە خوێنەری جدی ئەتوانێت سودی باشی لێوە ببینێت.

(١٧) بیرەوەریەکانی ساواکێك، عیسا پژمان. کە بەدەستی خۆی رادیۆکەی هێناوەو دایمەزراندوە بۆ حزب لەناوچەی چۆمان.باخوێنەر بگەرێتەوە بۆ

بیرەوەریەکانی. چیرۆکێکی دی هەیە دەڵێت کە گوایە دکتۆر فواد ئەو رادیۆیەی هێناوەو دای مەزراندوە ، بەڵام هیچ سەرچاوەیەکی بڵاوکراوە لەبەردەستانیە تا راستی ئەو چیرۆکە بسەلمێنێت.

(١٨) گفتوگۆیەکی رۆژنامەوانی لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد. رۆژ تیڤی.

(١٩) کتێبی رەچەڵەکی بارزانیەکان و نوسینی _ شێروانی.ئەم کتێبە کتێبێکی قەبارە بچوکەو قاچاخیشەو یەکێکە لەو کتێبانەی رەچەڵەکی بارزانیەکان تائاستێك دەرەخات.

(٢٠) بەڵگەنامەکانی بەریتانیا نوسینی دکتۆر کەمال . سایتە کوردیەکان. لەبەڵگەنامەکاندا بەشێك لەراستی بەدیدەکرێت هەرچەندە زۆریش رون نیە چونکە زیاتر بۆچونی ئەفسەرەکانی بەریتانیە.

(٢١) پەرتوکی عەرەبی، جەمال نەبەز، پاشان ئەم زانیاریە لە کتێبی هاورێی نامە بڵاو بوەتەوە وەك روداوێکی ئەو سەردەمە.

(٢٢) هاورێ نامە ، لە سەرچاوەی پەرتوکی کورد کریس کۆچێرا وەرگیراوە.

(٢٣) هەمان سەرچاوی پێشو، لەکتێبی کریس کۆچێراوە وەرگیرانەوە.

(٢٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو لە کتێبی کریس کۆچێرا وەرگیراوە.

(٢٥) هەمان سەرچاوی پێشوو.

(٢٦) هەمان سەرچاوی پێشوو.

(٢٧) هاورێ نامە لاپەرە( ٤٨٧)

(٢٨) هەمان سەرچاوە

(٢٩) هەمان سەرچاوە

(٣٠) هاورێ نامە ، لاەپەرە ٤٩٠

(٣١) هەمان سەرشاوەی پێشوو

(٣٢) گۆڤاری لڤین وتارێکی خۆم لەسەر خیانەتەکانی هەردوو حزب لەکۆنەوە بۆ نوێ. لەو تارەدا پشتم بەسەرچاوەی دی و شایەتحاڵەکانی ئەو سەردەمە بەستوە.

(٣٣) هاورێنامە ، لەکتێبی کرس کۆچێراوە وەرگیراوە.

(٣٤) کتێبی شەپۆل مێرگەر سوری لەسەر کوشتنی بنەماڵەکەیان.کچەکەی مێرگە سوری لەم کتێبەدا بەشێوەیەکی گشتی باس لە کوشتنی باوکی و بنەماڵەکەیان دەکات بەدەستی بارزانیەکان.

(٣٥) هاوریٚ نامە .

(٣٦) هەمان سەرچاوە.

(٣٧) هەمان سەرچاوە

(٣٨) هەمان سەرچاوە

(٣٩) عیسا پژمان بیرەوەری ساواکێك لە ئێران و کوردستان.

(٤٠) هاوری نامە.

(٤١) هاوری نامە.

(٤٢) گێرانەوەی چەند شایەت حاڵێکی رووداوەکان

(٤٣) گێرانەوەی چەند شایەت حاڵێکی رووداوەکان

(٤٤) گێرانەوەی چەند شایەت حاڵێك

(٤٥) گێرانەوەی شایەت حالەکان

(٤٦) گێرانەوەی شایەت حاڵەکان

(٤٧) بیرەوەریەکانی ئیبراهیم ئەحمەد

(٤٨) گێرانەوەی شایەت حالەکان

(٤٩) مێژووی کورد لەسەردەمی نۆزدە، کریس کۆچێرا، ئەم کتێبەی کریس کۆچێرا زیاتر لایەنگری پێوەیەو بەشێکی روداوەکانی بەو ئاراستەیە بردوە کە بەلای خۆیەوە باش بوون.

(٥٠) هاوڕێ نامە نوسینەوەی روداوەکانی هەرێم لەلایەن هاوڕێ باخەوانەوە کە بەشێکی روداوەکانی کورد لەم کتێبەدا نووسراونەتەوە.

(٥١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٥٢) عیسا پژمان. لەکتێبی بیرەوەری ساواکێکدا بەدرێژی باس لەم پەیوەندیەی ئیسرائیل و بارزانی دەکات. لەکتێبەکەی کرۆتیشدا هەمان باس کراوەو کتێبی ئەفسەرێکی موسادیش کە ئەوکات لەچۆمان بوە هەمان

باس دەگێڕێتەوەو کۆمەڵێك وینەی خۆی و ئەوکاتیش بلاو دەکاتەوە.

(٥٣) فەرنسۆ هەریری بۆئەوەی مێژوو بەچەواشەیی نەنوسرێت. ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ ئاوەچو کردنەوەی روداوەکان لەخزمەتی حزب.

(٥٤) هاوری نامە بۆ مێژوو.

(٥٥) هەمان سەرچاوە

(٥٦) هەمان سەرچاوە

(٥٧) هەمان سەرچاوە

(٥٨) هەمان سەرچاوە

(٥٩) کتێبەکەی کەیسنجەر بەشی روداوەکانی کوردستان

(٦٠) کتێبەکەی ڤانیعی فەر لەسەر مێژووی تاڵەبانی و پەیوەندیەکانی ئەیلول و ساواك.

(٦١) رستەیەك لە پەرەگرافی رێکەوتنەکەی جەزایر.

(٦٢) رۆژنامەی کەیهانی ئێرانی دیداری لەگەڵ بارزانی دوای ئاشبەتاڵ. ئەم دیدارەی بارزانی کە لەرۆژنامەی کەیهان

ئەنجامی داوە وەر گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لە گۆڤارە کوردیەکانیش بڵاو بوەتەوە.

(٦٣) خوێنەر بۆ دیاری کردنی ئەم دوو تەنزە بیرکردنەویە ئەتوانێت بگەرێتەوە بۆ سەرتاکانی دروست بونی حزب و ئەدەبیاتی حزبی لەکۆن و نوێدا.

(٦٤) گوتارێکی مەریوان وریا قانع لەرۆژنامەی ئاوێنە لەسەر فۆرمەکان حزبی کوردی.

(٦٥) ریبین ئەحمەد هەردی دیدارێکی رۆژنامەوانی لەگەڵ کەناڵی کەی ئێن ئێن بەرنامەی روبەرو.

(٦٦) باخوێنەر بگەرێتەوە بۆ دیدارەکانی ئیبراهیم ئەحمەد لەسەر جیابونەوەکەو تێگەیشتنی هەردولا لەسەر حزب.

(٦٧) بریاری ریکەوتن و شکست هێنان دوو بریارین ئەشێ خوێنەر لەسەریان بوەستێت و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکات بۆئەوەی تێبگات ئەم بریارانە سیاسین یاخود خێڵەکی. و دەستکەوت و شکستەکانیان چۆن بوون.

(٦٨) بەبریارێکی بارزانی یەکێتی زانایان دامەرزا و بویە رێکخراوێکی حزب وەك رێکخراوەکانی تری قوتابیان و ئافرەتان. باخوێنەر بگەرێتەوە بۆ کۆنگرەکانی پارتی.

(٦٩) راپۆرتێکی خۆم لەگۆڤاری لڤین لەسەر بونی حزب لەناو پایەکۆنەکانی خێڵدا.

(٧٠) شێخ و ئاغاو دەوڵەت، کتێبێك لەسەر مێژووی کورد و پەیوەندی ئەو سێ تاقمە بەدەسەلاتەوە.

(٧١) کتێبەکەی زراری سلێمان بەگ کەخۆی یەکێك بوە لەوانەی لەگەڵ بارزانی سەفەری کردوە بۆ سۆڤیەت بەدرێژی قسەلەسەر ئەو سۆفیانەدەکات کە لەگەڵ بارزانی بوون و باسیش لەناکۆکیەکانی نێوانیان دەکات لەسەردەمی ئاوارەیدا.

(٧٢) راپۆرتێك لەسەر بارزانی و خێڵەکەی گۆڤاری لڤین و رۆژنامەی هاولاتی. زۆرێك لەو راپۆرتانە بەپشت بەستن بە سەرچاوەکان ئەنجام دراون و بەشێکی زۆری روداوەکانیش لەرێگەی شایەتحاڵەکانەوە گواستراونەتەوە ناو کایەی رۆژنامەگەری.

(٧٣) خوێنەر بابگەرێتەوە بۆکتێبەکەی مەسعود بارزانی لەسەر خەباتی بارزانی باوکی و بەراوردێك بکات لەنێوان هەردوکیاندا. لەسەر چەمکەکانی دیموکراسی و کرانەوە و ئازادیەکانی ئەوانی دی.

(٧٤) کتێبی رەچەڵەکی بارزانیەکان.

(٧٥) دیدارێکی ئیبراهیم ئەحمەد لەسەر مێژووی کۆن تیڤی .

(٧٦) دیداری ئیبراهیم ئەحمەد و گێرانەوەی مێژووی کۆن.

(٧٧) کتێبی ئەیوب بارزانی کە کوری شێخ بابۆیەو ئامۆزای مەسعود بارزانیەو ئێستە لەدەرەوەی وڵات دەژێت و یەکێکە لەوکەسانەی بەهۆی ناکۆکی خێڵەکیەوە لەگەڵ هێزە ئۆپۆزسیۆنەکان کاردەکات و کتێبەکانیشی لەسنووری پارتی قەدەغەن. تاکو ئێستەش چەند کتێبێکی لەسەر مێژووی ئەو بنەماڵەیەو خەباتی کورد نوسیەوەو بەداخەوە هیچ کام لەکتێبەکانیشی وەرنەگێراونەتە سەرزمانی کوردی.

(٧٨) خودانی بارزانی وشەیەکە تەنها بۆشێخ ئەحمەدی بارزانی بەکار هاتوەو مەبەست لەم وشەیە ئەوەی کە گەورەی هەمووومانەو بارزانیەکان بەم دیدەوە سەیری شێخ ئەحمەدیان کردوە.

(٧٩) شێخ عوسمان یەکێکە لەبراکانی بارزانی و بەجۆرێك لەجۆرەکان ناکۆکیش بوە لەگەڵ بارزانی لەسەر هەندێك کاروباری خێڵەکی.

(٨٠)    لەکتێبی رەچەڵەکی بارزانیەکان بەشێوەیکی سەرتایی قسەلەسەر خورشیدیەکان کراوە.

(٨١)    کتێبی رەچەڵەکی بارزانیەکان

(٨٢)    چیرۆکی ئەو کەسانەی لەناوچەکە دەژین و حکایەتی دەماو دەم دەگێرنەوە باروەیان وایە ئەوان لە ناو زێباریەکانەوە هاتون. ناکۆکیەکەشیان لەگەڵ زێباریەکان دەگەرێتەوە بۆ ئەو کاتە.

(٨٣)    هاولآتی: فاشیەت و حزبی کوردی، گۆشەی هەناسە. نەبەز گۆران